# ئیسلام
# و
# کاریگەریی لەسەر شارستانییەت و چاکەی بەسەر مرۆڤایەتییەوە

توێژینەوەیەکی مێژوویی و شیکارییە دەربارەی
کاریگەریی ئیسلام و فروستادەیی محەممەد (دروودی خوای لەسەر)
لە سەر شارستانییەتی مرۆڤایەتی

**نووسینی: ئەبو لحەسەنی نەدوی**
**وەرگێڕانی: تاهیر یەحیا جەباری**

**ئیسلام و کاریگەریی لەسەر شارستانییەت و**
**چاکەی بەسەر مرۆڤایەتییەوە**

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە (٢٨ )

- نووسینی: ئەبو لحەسەنی نەدوی
- وەرگێڕانی: تاهیر یەحیا جەباری
- بابەت: فیکری و مێژوویی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپ: دووەم. ٢٠١٩. ناوەندی ڕینوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( ١٣٣٥ )ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی نزیک پردی خەسرەوخاڵ
07702422171

## ناوەرۆك

# پێشەکی وەرگێڕ

**الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه.**

زانای پایە بەرز (أبو الحسن الندوی) یەکێکە لە بلیمەتە ناودارەکانی جیهانی ئیسلامی، کە خزمەتێکی گەورەی بە ئاییینی ئیسلام و فیکری ئیسلامی کردووە، ئەوەی ــ دوای فەزڵی خوا ــ یارمەتی ئەم کەڵە زانایەی داوە کە ئەو بابەتانەی لێی دواوە زۆر بە تۆکمەیی و قەشەنگی بیخاتەڕوو، ئەوەیە کە هەر لە سەرەتای ژیانیەوە دەستی بە خوێندنی زانستە ئیسلامییەکان کردووە و بە جوانی لێیان بەهرەمەند بووە، پاشان دەرکی بە واقیعی تفتو تاڵی جیهانی ئیسلامی کردووە و لە دەرد و نەخۆشی و فاکتەرەکانی لاوازی مسوڵمانان تێگەیشتووە و چووەتە مەیدانی کار و کۆشش و هەوڵی چارەسەرکردنیانی داوە.

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی سەرکەوتوویی ئەم بلیمەتە ئەوەیە کە بە باشی زمانی ئینگلیزی زانیوە و خوێندنەوەی لە سەرچاوەکانی مێژوو و فیکر و مەعریفەدا هەبووە کە بەم زمانە نوسراون، وەك لە بەرهەم و نووسراوەکانیدا دەردەکەوێت.

منیش وەك فێرخوازێکی زانستە ئیسلامییەکان، دوای ئەوەی سوودم لە هەندێك لە کتێب و نووسراوەکانی ئەم بەڕێزە وەرگرت بە پێویستم زانی ئەم نامیلکە بە پێزە (کە وەك گەنجینەیەك لێی دەڕوانم) وەرگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، بە ئومێدی ئەوەی خوێندەوارانی گەلەکەم لێی بەهرەمەند بن و سووودو چێژی لێوەرگرن.

ئیشەکانی من لە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمەدا:

١- تەفسیرکردنی ئایەتەکان: ئەویش بە سوودوەرگرتن لە تەفسیرە کوردیەکانی، وەك: پوختەی تەفسیری قورئان، تەفسیری ئاسان، خوڵاصەی تەفسیری نامی، تەفسیری گوڵشەن، هەروەها چەند تەفسیرێکی عەرەبی، وەك: (ابن کثیر)، سەعدی.

٢- راڤەکردنی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری مەزن (دروودی خوای لەسەر)، بەسوودوەرگرتن لە کتێبەکانی راڤەکرددنی فەرمووده.. وەك کتێبی (فتح الباری)، (شرح صحیح مسلم)... هتد.

٣- تەخریجکردنی زۆرێك لە فەرموودەکان.

٤- روونکردنەوەی هەندێك زاراوەی فیکریی و فەلسەفی.

ئەم دووانەی کۆتاییم لە پەراوێزدا نووسیوە، بەڵام دووانەکەی سەرەتام لە ناوەڕۆکی کتێبەکەدا هێشتووەتەوە، چونکە پەیوەندی راستەوخۆیان بە ناوەڕۆکەوە هەیە.

٥- هەروەها ئەوەی کە وتە و سەرنجی من بێت لە کۆتایی پەراوێزەکەدا لە نێوان دوو کەوانەدا نووسیومە (تاهر)، تاوەکو لە سەرنجەکانی نووسەر، یان ئامادەکاری کتێبەکە بۆ چاپی عەرەبی، جیابکرێتەوە.

٦- لابردنی پێشەکییەکی تاڕادەیەك درێژ، کە باس لە بیرۆکە و هۆکاری نووسینی نامیلکەکە دەکات.

تێبینی: بۆ وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە پشتم بە چاپی یەکەمی (دار ابن کپیر) بەستووە کە لە ساڵی ١٩٩٩ ز، بە سەرپەرشتی (السید عبدالماجد الغوری )، کە یەکێکە لە قوتابییەکانی نووسەر، چاپکراوە.

ئەم تێبینییە بۆ ئەوەیە هەر بەڕێزێك ئەگەر جیاوازییەكی بەدی كرد لە وەرگێڕانەكەی من و چاپەكانی دیكەی كتێبەكەدا ئاگاداری ئەوە بێت كە من بە ئەمانەتەوە لەو چاپەوە كە لەسەرەوە باسم كرد، وەرمگێڕاوە.

لەكۆتاییدا: داواكارم لە خودای پەروەردگار ئەم كارەم بە چاكە لێوەربگرێت و بیكاتە مایەی خێر و بەرەكەت بۆ منیش و سەرجەم خوێنەران.

**وصلى الله وسلم على المبعوث رحمة للعالمين.**

**تاهیر یەحیا جەباری**

**شۆڕش ـ چەمچەماڵ**

## فراوانی بابەتەکە و جیهانێتیەکەی

بەڕاستی بابەتی (ئیسلام و کاریگەریی لەسەر شارستانییەت) بابەتێکی واقیعی و زەرورییە، بە تەنیا پەیوەندی پتەوی بە فروستادەیی محەممەد و پەیامی ئیسلام و ڕێنماییەکانیەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە واقیعی ژیان و ئێستا و ئایندەی مرۆڤایەتی و ڕۆڵی ئوممەتی ئیسلامی لە بنیاتنانی شارستانیەت و ئاراستەکردنیشیدا هەیە.

بابەتەکە زیاتر شایستەی کاری کۆربەندێکی زانستیی (مجمع علمی)ـە تا هەوڵێکی تاکەکەسی بێت، بەڕاستی سروشتی بابەتەکە جیهانیی و ئینسانییە، بەسەر چەندەها ڕووبەری فراوانی جۆراوجۆردا درێژ دەبێتەوە، ڕووبەرە زەمانیەکەی لە سەدەی یەکەمی ئیسلامییەوە هەتا ئەم سەدەیەی کە تیایدا دەژین، درێژ دەبێتەوە، ڕووبەری مەکانیشی (جێگەیی) لەوپەڕی جیهانەوە تا ئەوپەڕی درێژدەبێتەوە، بەڵام ڕووبەری مەعنەوی لە بواری عەقیدەوە هەتا بواری ڕەوشت و ئاکار، لە بواری کۆمەڵ و ژیانی ناوماڵ و تاکەکەسییەوە بۆ بواری سیاسەت و یاسادانان و قانون و پەیوەندی گەل و نەتەوەکان لەگەڵ یەکتردا، لەبواری مەدەنیەتی پێشکەوتووی ناسك و جوانەوە بۆ بواری هونەری بیناسازی و ئەدەب و شیعر و تام و چێژی بەرز، درێژ دەبێتەوە.

هەریەکە لەم ڕووبەرانە خۆی لە خۆیدا ڕووبەرێکی فراوانە، خاوەنی چەندەها لایەنی بەربڵاوە، بۆیە جگە لە کۆڕبەندێکی زانستی (مجمع علمی) ناتوانێت بە تەواوەتی مافی ئەم بابەتە بدات.

ئەم کۆڕبەندە دەبێت پێکهاتبێت لە مامۆستایانی کارامە و توانادار، کە لەو ماددانەی پێیان دەسپێردرێت، کە توێژینەوەی تێدا بکەن خاوەنی

پسپۆڕیی (إختصاص) بن و پەیوەندی پتەویان لەگەڵ بابەتەکەدا هەبێت، ئەو بابەتەی کە قورسیی دەخاتە سەر شانی دەستەیەکی توانادار لە زانست و دیراسەی متمانەدار و ڕاست و پاك لە حوکمدان بەسەر شتەکاندا، دەستەیەك بن ئازا و چاونەترس لە ڕا دەربڕین و ئاشکراکردنی ئەنجامە زانستییەکاندا، یەکێك لە مامۆستایان هەستێت بە توێژینەوەی لایەنی عەقیدەو بیری ئایینی، یەکێکی دیکە بەلایەنی کۆمەڵایەتی و سێیەم بە یاسادانان و قانون و چوارەم بە بنەمای ئازادیی و یەکسانی و پێنجەمیش بە مافەکانی ئافرەت و پلەو پایەی لە کۆمەڵگادا.. هتد.

جا ئەوە شایستەترە بە (مەوسوعە/ئەنسکلۆبیدیا)یەکی تایبەت بەم بابەتەوە، چ جای کتێبێك، چ جای لێکۆڵینەوەیەکی لەم شێوەیە، کە بە ماوەیەکی کورت ئامادەبکرێت، لەگەڵ پەرتەوازەیی هزر و زۆری کاردا، بەڵام وەك پێشینان گوتویانە (ما لا يُدرَكُ كُلُّه لا يُترَك كُلُّه) واتە: (ئەوەی بەهەموویدا ڕانەگەهێشترێت هەموویشی واز لێناهێنرێت)، هیچ گوتەیەکیش لە فەرمایشتەی خودا بەهێزتر نییە کە دەفەرموێت: (فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ). ( البقره: ٢٦٥).

واتە: ئەگەر ئەو باخەی بەسەر بەرزاییەکەوەیە ــ کە نموونەی ماڵ بەخشینە لەپێناو خوادا ــ بارانێکی ڕێژنەی بەرنەکەوێت، ئەوا نەرمەبارانێکی هەر بەسەردا دەبارێت.[١]

---

[١] ئەم ئایەتە خۆی باسی ئەوە دەکات کە نموونەی ئەو کەسانەی لە پێناو خودادا دەبەخشن وێنەی باخێکە بەسەر بەرزاییەکەوە، ئەگەر بارانی ڕێژنەی بەسەردا ببارێت ئەوا دووقات بەر دەگرێت، بەڵام ئەگەر ڕێژنەبارانی بەسەردا نەبارێت ئەوا نەرمەبارانێکی هەر بەردەکەوێت تا وەکو بەربگرێت و خاوەنی سوودی لێوەربگرێت، لە ئایەتەکەوە ئەوە دەخوێنرێتەوە کە بەخشینەکان پاداشتیان وەك یەك نییە، چونکە پاداشتەکە بە گوێرەی

## قورسترین و وردترین پڕۆسه

یەكێك لە قورسترین و وردترینی پڕۆسەكان ئەوەیە، كە شیكارییەكی كیمیایی بكەی بۆ شارستانییەتێك كە شتی دیكەی زۆری تێكەڵبووبێت، بێیت هەموو ئەو توخمانەی كە لە سەردەمی جیاجیادا و لە سەردەم و مێژوویەكی دیارییكراودا تێیكەوتوون جیایان بكەیتەوە و بیانگێڕێتەوە بۆ بنەڕەت و سەرچاوەكانی خۆیان و ئەندازە و مەودای كاریگەری دیاریی بكەیت و ئەوە دیاری بكەیت كە فەزڵی ئەم بەخششە شارستانییە و ئەم گۆڕانە ڕیشەییە بۆ كێ دەگەڕێتەوە؟.

ئەم توخم و ڕەگەزانەو ئەم كاریگەرییانە تێكەڵ بە پەیكەری شارستانی و كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بوون و بە ناخیدا ڕۆچوونە، جێگەی خوێن و ڕۆحیان گرتووەتەوە و كارلێكیان كردووە و تێكەڵە و سروشتێكی تایبەت بەم شارستانییەتەی لێپێكهاتووە، بە ئەندازەی فاكتەرەكانی پێكهێنان و پەروەردە و ژینگەو خۆراك لە ژیانی تاك و پێكهێنانی كەسیتییەكی تایبەتدا بۆی، ڕۆڵ دەبینێت.

---

نییەتی خاوەنەكەی و حەلاڵی و چاكی و پاكیماڵەكە دەگوڕێت، بەلاّم مادام هەركەسێك لە پێنا و خودادا ببەخشێت، ئەگەر پاداشتەكەشی بەتەواوی ( ١ ــ ٧٠٠ ) دەست نەكەوێت، ئەوا خودای گەورە ڕەنجەكەی بەفیڕۆ نادات و بە گوێرەی بەخشینەكەی پاداشتی دەداتەوە.

جا ئەمەی دانەر كردوویەتی لە زانستی ڕەوانبێژی (بلاغە)دا پێیدەوترێت ((إقتباس)) واتە: وەرگرتن (لە ڕەوانبێژیی كوردیدا پێی دەوترێت تێهەڵكێش) كە ئایەتێك، یان فەرموودەیەك، یان هەر گووتەیەك لە باسێكدا وتراون، بەلاّم لەشوێنێكی گونجاو (لە شیعر، یان پەخشان)دا دایبنێت.

جا لێرەشدا دانەر مەبەستی ئەوەیە، ئەگەر نەتوانێت ئەم بابەتەی كە هەڵیبژاردووە لەسەری بنووسێت و سەدا سەد بیپێكێت، ئەوا بە گوێرەی توانای خۆی ـ كە توانایەكی كەم نییە ـ هەوڵی لەگەڵ دەدات. (طاهر)

تائێستا تاقیگەیەکی کیمیایی دانەهێنراوە، کە بتوانێت بە کرداری شیکاری مێژوویی هەڵبسێت، میکرۆسکۆپێکیش دانەهێنراوە بتوانێت ئەو بەشە وردانەی، کە ڕۆڵیان لە پێکهێنانی شارستانیەتدا بینیوە گەورە بکاتەوە.

کەواتە بە ناچاری دەبێت لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانی مێژووی گەل و نەتەوە و وڵات و کۆمەڵگاکان بکرێت، تا بتوانین بەراورد لە نێوان ڕابردوو و ئێستایاندا بکەین و پەی بە کاری بانگەوازی ئیسلامی و فروستادەیی موحممەدیی ببەین لە گۆڕین و چاککردنی عەقیدەدا و لە ناوبردنی پاشماوەی جاهیلییەت و فەلسەفە بتپەرستییەکان و نەریتە بەجێماوەکان و گۆڕینی تەوژمی فیکریی لەئاڕاستەیەکەوە بەرەو ئاڕاستەیەکی دیکەو گۆڕینی شۆڕشگێڕانە لە بەهاکاندا و چاککردنی مەدەنییەت و شارستانییەتەکان بە بژارکردن و راستکردنەوە، ئەوەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی درێژخایەن هەیە، هەروەك پێویستی بە خۆماندووکردنێکی دەروونی و عەقڵی هەیە، بەڵام کارێکی بەسوودیشە.

ئەگەر دامەزراوەیەکی زانستیی وەکو یۆنسکۆ (**Unesco**)، یان کۆڕبەندێکی زانستیی لە ئەوروپا و ئەمریکا لەم کارەدا سەرکەوتوو نەبووبێت، ئەوا ناچار دەبێت کۆڕبەندێکی زانستی، یان زانکۆیەك لە زانکۆ ئیسلامییەکانی بۆ لە یەکێك لە پایتەختەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامییدا تەرخان بکرێت، گومانی تێدا نییە ئەم کارە بەسوودتر و لە زۆرێك لەو کارە زانستییانەی کە ئەم کۆڕبەند و زانکۆیانە پێیهەڵدەسن لەپێشترە و توانا و کەرەستەی زۆریشی دەخرێتە خزمەت.

## گرانی و قورسی دیارییکردنی بوارەکانی کاریگەریی

دیارییکردنی هەموو بوارەکانی کاریگەریی ئیسلامی لەسەر شارستانییەتی مرۆڤایەتی زەحمەتە و تا ڕاددەیەك کرداریی (عملی) نییە، چونکە ئەم کارتێکردنە تێکەڵ بە دەزگای شارستانییەت بووە وەك تێکەڵبوونی خوێن و گۆشت، وایلێهاتووە گەل و نەتەوەکانیش هەست بەم کاریگەرییانە ناکەن، هیچ کاتێك ئەوە بەخەیاڵیاندا نایەت، کە ئەو کاریگەرییانە ڕەگەز و توخمی نامۆ و بێگانە بن، چونکە بوونەتە بەشێك لە پێکهاتە و بیرکردنەوە و مەدەنییەت و ژیانیان.

ئێستا هەندێك لە کتێبی (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمین) وەردەگرم و لێرەدا دەیخەمەڕوو لەو زانیارییانەی، کە پێشتر لەوێدا گوتومە لەسەر مەدەنییەتی ئیسلامی و کاریگەری لەسەر ئاڕاستەی مرۆڤایەتی.

## کاریگەربوونی جیهانیی گشتی

(سروشت و عەقڵی خەڵکان دەگۆڕا و کاریگەر دەبوو بە ئیسلام، چ خۆیان هەستیان پێبکردایە یان هەستیان پێنەکردایە، وەك چۆن سروشتی مرۆڤ لەگەڵ ڕووەك و گوڵ و گیاکان لە وەرزی بەهاردا کاریگەر دەبێت.

دڵەیاخی و دوورەپەرێز و ڕەقەکان دەستییان بە نەرم بوون و ناسکبوونەوە کرد و بنەما و ڕاستییەکانی (حقائق) ئیسلام بەرەو قووڵایی دەروونەکان و ڕۆچوون بە ناخەکاندا دەستی بە تەشەنە کرد، بەهای شتەکان لەبەرچاوی خەڵك دەستییان بە گۆڕان کرد، کێشانە و پێوانە کۆنەکان دەگۆڕان و کێشانە و پێوانەی نوێ جێیان دەگرتنەوە، جاهیلییەت بووە بزووتنەوەیەکی کۆنەویستی (رجعی) و پارێزگارییلێکردنی بوو بووە

گێلی و چەقبەستوویی (جمود) و ئیسلام بوو بە شتێكی پێشكەوتووی سەردەمییانە و خۆوەپاڵدان و دەركەوتن بە دیمەنەكانی بوو بووە نەجابەت و ژیری.

نەتەوەكان، بگرە سەرجەم دانیشتوانی سەر زەوی وردە وردە لە ئیسلام نزیكدەبوونەوە، بەڵام خەڵكەكە هەستیان بە ڕۆیشتنی خۆیان نەدەكرد، هەروەك خەڵكی سەرزەوی هەست بە خولانەوەیان ناكەن بە دەوری خۆردا.

ئەوەش بە فەلسەفە و ئایین و مەدەنییەتیانەوە دەردەكەوێت، ناخ و ناوەڕۆكیان ئەوە نیشان دەدات و بزاڤە چاكسازییەكانیان ئەوە دەردەخات، تەنانەت ئەو چاكسازییانەش، كە دوای نزمبوونەوە و بێهێزبوونی مسوڵمانان سەریانهەڵدا) [1] .

---

[1] ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين (ط ٦٦ طبعة دار ابن كثير الأولى بيروت ١٩٩٩م) ص ١٥٧.

## ١٠ بەخشش و دیاری گرنگ و بنەڕەتی

ئەگەر ناچار بمانەوێت هەندێك لایەن و بوار دیاری بکەین لە ژیانی نەتەوە و گەلان و شارستانییەتدا، کە کاریگەری ئیسلامی لە دیارترین شێوەدا تێدا دەرکەوتبێت، ئەوا ــ بەکورتکردنەوە و هەڵبژاردنەوە ــ لە (١٠) بەخششی گرنگو دیاریی گرانبەهای بنەڕەتیدا دەستنیشانی دەکەین، کە دەوری گەورەیان لە ئاڕاستەکردن و چاککردن و ڕێنمایی و هەستانەوە و گەشەکردنی مرۆڤدا بینیوە و جیهانێکی پڕشنگداری نوێیان هێناوەتەکایەوە، کە لە هیچ شتێکدا لە جیهانی ڕەنگ بزڕکا و و ڕەنگ پەڕیوی کۆن ناچێت.

ئەو بەخشش و دیارییانەش خۆی لەم بنەمایانەی خوارەوەدا دەبینێتەوە:

١–عەقیدەی پاك و ڕوونی یەکتاپەرستی.

٢–بنەمای یەکێتی مرۆڤایەتی و یەکسانی مرۆیی.

٣– ڕاگەیاندنی ڕێز و بڵندیی مرۆڤ.

٤–گێڕانەوەی ڕێز بۆ ئافرەت و پێدانی ماف و بەشەکانی.

٥–بەربەرەکانێی نائومێدیی و ڕەشبینی و بووژاندنەوەی ئومێد و هیوا و متمانە و شانازی لە دەروونی مرۆڤدا.

٦– کۆکردنەوەی دین و دنیا پێکەوە و یەکخستنی ڕیزە لێکسلەمیوەکان (الصفوف المتنافره) و سەربازگە بەشەڕهاتووەکان.

٧– هێنانەکایەی پەیوەندییەکی پیرۆزی هەمیشەیی لە نێوان دین و زانستدا و بەستنەوەی ئایندەی هەریەکەیان بەوی دیکەیانەوە و مەزن

تەماشاکردنی زانست و هاندان لە سەر وەدەستهێنانی و ئاڕاستەکردنی تاوەکو ببێتە زانستێکی ئامانجدار و بەسوود و گەیەنەر بۆ لای خوا.

٨- بەکارهێنان و سوودمەندبوون لە عەقڵ، تەنانەت لە بابەتە ئاینییەکانیشدا و هاندان لەسەر سەرنجدان و تێڕامان لە خودی مرۆڤ و دەوروبەری.

٩-جەختکردن لە ئوممەتی ئیسلامی بۆ قەبوڵکردنی بەرپرسیارێتی سەروەسێتی (وصایە) و چاودێرییکردن بەسەر جیهانەوە و چاودێرییکردنی رەوشت و ئاڕاستە و ئاکاری تاك و نەتەوەکان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی بەرپاکردنی دادپەروەریی و شایەتیدان لە پێناو خوادا ـ بەسەر خەڵکەوە ـ.

١٠- یەکێتی عەقائیدیی شارستانێتی جیهانیی (الوحدة العقائدية الحضارية العالمية).

لە ژێر هەریەکە لەم سەرباسانەدا چیرۆکێکی درێژ و پێشچاوخستنێکی ورد و ئەمینانە دەخوێنیتەوە، وێڕای خستنەڕوویەکی درێژی شارستانییەتەکان و چاخەکانی نەفامی، کە پێش هاتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کەوتبوون و ئەو مرۆڤەی کە لە دوای پێغەمبەرایەتی لە دایك بووە.

هەریەکە لەم سەرباسانە بابەتی کتێبێکی سەربەخۆیە، کە ڕەنگە هەڵبگرێت سەدەها لاپەڕەی لەسەر بنووسرێت.

ئێستاش لەسەر یەك بەیەکی ئەو بوارانە دەدوێین کە کاریگەریی ڕیشەیی و خەباتکارانەی ئیسلامی تێدا دەرکەوتووە و تیشك دەخەینە سەر مەودا و بەرفراوانیی کاریگەری ئیسلام و ڕێنماییە مرۆڤایەتی و جیهانییەکانی.

لەسەر یەکەم دیاریی ئیسلام و شاکاری گەورەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) دەدوێین، ئەویش ئەوەیە کە عەقیدەی یەکتاپەرستی پاك و بێگەرد و بەنرخی بە دیاری بەخشیە مرۆڤایەتی، عەقیدەیەکی شۆڕشگێڕانەیە، موعجیزەیە، ژیان و هێزی لێهەڵدەقولێت، بارودۆخەکان هەڵدەگێڕێتەوە ـ لە خراپەوە بۆ باش ـ تێکشکێنەری پەرستراوە پوچەڵەکانە، مرۆڤایەتی هاووێنەی ئەمی دەست نەکەوتووە و هەتا ڕۆژی قیامەتیش دەستی ناکەوێت.[1]

---

[1] دیارە دەبێت ئەوەی لێهەلاوێر بکرێت کە پێغەمبەرانی پێشوو هێناویانە، چونکە هەموو پێغەمبەران بانگەوازیان بۆ یەکتاپەرستی کردووە و بنچینەی بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بووە و هەمووشیان بە ڕوونی و پاك و چاکی ڕاگەیاندووە، وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: ((وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ))، واتە: لە هەموو ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە بە گەلەکەی بڵێت خودا بپەرستن و لە تاغوت، خۆدووربگرن.

مەگەر ئەوە بگوترێت کە ئەم عەقیدەی یەکتاپەرستیە لە ناو شوێنکەوتووانی هیچ کام لە پێغەمبەراندا بە پاك و پوختی و بۆ ماوەیەکی درێژ نەمایەوە، وەك لەنێو ئوممەتی ئیسلامیدا ماوەتەوە، چونکە خوای پەروەردگار پاراستنی کتێبی پێغەمبەرانی پێشووی نەخستۆتە سەر خۆی و دەوڵەت و شارستانییەتی بەهێزی لەسەر دروست نەبووە، وەك ئەوەی کە لەسەر ئیسلام دروست بووە، بەڵام خوای گەورە پاراستنی قورئانی مسۆگەر کردووە (( إنا نحنُ نزّلْنا الذِكرَ وإنا لَهُ لَحافِظون))، شارستانییەتێکی لە سەر دروست بوو زیاتر لە سیازدە سەدە درێژەی هەبوو، ئێستاش ئەگەر هەلومەرجی لەباری بۆ بڕەخسێنرێت ئەوا دەبێتە سایە و سێبەری مرۆڤایەتی.

ئەمجا ئەمێنێتەوە سەرجەم ئەو گەل و ئوممەتانەی کە بێبەشبوون لە ڕێنمایی پێغەمبەران، هەر هەمووی لە زۆنگاوی شیرك و نیگەرانی و دوودڵییدا دەژیان، تەنانەت شوێنکەوتووانی تەورات و ئینجیلیش بە ماوەیەکی کەم لە دوای هەردوو پێغەمبەر موسا و پێغەمبەر عیسا ـ علیهما السلام ـ کەوتنە گۆڕین و دەستکارییکردنی ئەو دوو کتێبە و جارێکی دیکە شیرك و نەفامی بەنێو خەڵکدا بڵاوبووەوە و نەوە و ڕۆڵەیان بۆ خودا بڕیاردا، وەك دیانەکان دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە، یەهودییەکانیش دەڵێن: عوزێر کوڕی خودایە.

## هاوبەشدانان (شرك) و بتپەرستی و کاریگەرییان لە ژیانی مرۆڤدا

ئەم مرۆڤەی کە هەڵگری لافوگەزافی بریقەدارە، لە شیعر و فەلسەفە و سیاسەت و کۆمەڵناسی، ئەم مرۆڤەی چەندەها جار گەلان و وڵاتانی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی و ژێر دەستەی کردوون و بەردی ڕەق و تەقی گۆڕیوە بۆ گوڵ و گوڵزاری بۆنخۆش و جۆگە و جۆباری بەنێو شاخەکاندا ڕاکێشاوە، ئەم مرۆڤەی هەندێکجار لافی پەروەردگارێتی لێداوە و کڕنووشی بۆ شتانێکی بێنرخ و بێبەها بردووە، کە نە زیان دەگەیەنن و نە سوود، نە دەبەخشن و نە دەگرنەوە و قەدەغە دەکەن. (وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لاَّ يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ) (الحج: ٧٣).

واتە: (ئەگەر مێش شتێك لەو پەرستراوانە بڕفێنێت کە ئێوە دەیپەرستن، ناتوانن لێی بسێننەوە، داواکار و داوالێکرا و بێتوانا و بێدەسەڵاتن).

هەروەها مرۆڤ سەری دادەنەواند لەبەردەم شتانێکدا، کە خۆی دروستیانی کردبوو، لێیان دەترسا و ئومێدی چاکەی پێیان هەبوو، ئەو بە تەنها کڕنووشی بۆ شاخ و ڕووبار و دار و درەخت و ئاژەڵ و ئەڕواح و شەیتانەکان و دیاردەکانی دیکەی سروشت نەدەبرد، بەڵکو کڕنووشی بۆ مێروو و کرمەکانیش دەبرد، ژیانی هەموو لە خەون و خەیاڵات و وەسوەسە و خەیاڵ و هیوای درۆزنەدا بەسەر دەبرد، دەرەئەنجامە چاوەڕوانکراوەکەشی بریتی بوو لە ترس و لاوازی، بێسەرەو بەرەیی فیکری و نیگەرانی دەروونی (القلق النفسي) و بێمتمانەی و ناجێگیریی و نائارامی!.

---

هەردوولاش کەوتنە ژێر کاریگەری فەلسەفە بڵاوەکانی کاتی خۆیان و کاربەدەست و فەرمانڕەواکانیش ڕۆڵی گەورەیان لەو شێواندن و گۆڕینەی کە بەسەر ئەم دوو ئایینەدا هات، هەبوو. (طاهر).

هیندی ــ براهمایی بەشێوەیەکی تایبەت ـ بە زۆری پەرستراوەکان جیادەکرایەوە، لە سەدەی شەشەمی مەسیحی (زایینی)دا گەیشتبووە چڵەپۆپە و ژمارەی بت و پەرستراوەکان لە هیندستاندا گەیشتبووە ٣٣٠ ملیۆن[(١)] ، وایلێهاتبوو هەموو شتێکی مەترسیدار و هەموو شتێکی بەسوود کرابووە پەرستراو و دەپەرسترا!.

## عەقیدەی یەکتاپەرستی و کاریگەری لە ژیاندا

قورئانی پیرۆز و پەیامی موحەممەدی ڕایانگەیاندووە: ئەم جیهانە بێ خاوەن و بێ پادشا نییە و لەهەمانکاتیشدا دەوڵەتێکی هاوبەشی چەند پادشایەك نییە، بەڵکو یەك پادشای هەیە، ئەویش: وەدیهێنەر و دروستکار و حوکمڕان و هەڵسوڕێنەرێتی، وەدیهێنان و فەرمان و حوکم هەر هەمووی هی ئەوە (أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ) (الأعراف: ٥٤). واتە: (بێداربن، بەدیهێنان و فەرماندان هەر بۆ خودایە).

هیچ شتێك لەم جیهانەدا ڕوونادات بە فەرمان و قودرەتی ئەو نەبێت، هۆکاری ڕاستەقینەی بوونی ئەم جیهانە بریتییە لە ئیرادە و قودرەتی ئەو، ئەم بوونەوەرەش تێکڕا ملکەچی ئەون، هەم لە پێکهاتن و هەم لە بوونیدا جڵەوی بەدەستی ئەوە و لە ژێر فەرمانی ئەودایە، (وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا) (آل عمران: ٨٣)

---

(١) تەماشای کتێبی ((الهند القديمة = هیندی کۆن)) بکە، کە هی ((ئار، سی، دوت))ـە، Ancint India, Vol. III P.٢٧٦(١٨٩١) & L.S.S.O. Malley , ((R, C, Dutt ) Popular Hindusim – The Religion of masses – Combridge (١٩٣٥).

واتە: (هەرچی لە ئاسمان و زەویدایە فەرمانبەری خودان بیانەوێ ــ بە ویستی خۆیان ــ، یان نە یانەوێ ــ بە ناچاری ــ).

جا پێویستە لەسەر ئەو دروستکراوانەی، کە خاوەنی ئیرادە و هەڵبژاردنن ــ ئازادی هەڵبژادنیان پێدراوە ــ ملکەچی بن، (أَلاَ لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ) (الزمر: ٣). واتە : (بێدار بە، ئایینی (ملکەچی) پاك و خاوێن هەر بۆ خوایە).

بەڕاستی یەکەم کاریگەری عەقڵیی بەسەر مرۆڤەوە کە لەسەر ئەم عەقیدەیە دادەمەزرێت ئەوەیە، کە ئەم جیهانە هەمووی شوێنکەوتووی یەك ناوەند (مرکز) و یەك سیستمە، مرۆڤیش لە هەموو پارچە بڵاوەکانی ئەم جیهانەدا پەیوەندی ئاشکرا و یەك سەرچاوەیی لە یاساکانیدا دەبینێت، پاشان لە دوای ئەم عەقیدەوە مرۆڤ دەتوانێت ڕاڤەیەکی تەواوی هەموو ژیان بکات، فیکر و کرداری لەم بوونەوەرەدا لەسەر دانایی و بەرچاوڕوونی، جێگیر بکات.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) مرۆڤی دەوڵەمەند و سوودمەند کرد بە عەقیدەیەکی بێخەوش و پاك، ئاسان، سادە و بێگرێ و گۆڵ، پاڵنەرە بۆ هیممەتبەرزی و بوژێنەرەوەی ژیانە، بەو هۆیەوە مرۆڤ لە هەموو ترس و بیمێك ڕزگاری بوو، وایلێهات جگە لە خودا لە کەس نەدەترسا و بەدڵنیاییەوە زانی کە بە تەنها ئەو زیانگەیەنەر (الضار) و سوودگەیەنەر (النافع) و بەخشەر (المعطي) و قەدەغەکار (المانع)ـەو تەنها خودا دابینکاری هەموو پێویستییەکانی مرۆڤە، بەم ناسین و زانینە نوێیە و بەم دۆزینەوە نوێیە هەموو جیهان لە پێش چاویدا گۆڕا و پارێزراو بوو لە هەموو بەندایەتی و کۆیلایەتییەك ــ بۆ غەیری خودا ــ و لە هەموو ئومێدو ترسێك

(الرجاء والخوف) له دروستكراو و مه‌خلوقێك و له هه‌موو شتێك، كه خه‌یاڵی په‌رته‌وازه بكات و فیكری بشێوێنێت.

بۆیه مرۆڤ هه‌ست به یه‌كێتی و یه‌ك سه‌رچاوه‌یی ده‌كات له‌م هه‌موو شته زۆرو زه‌وه‌نده‌دا و خۆی به به‌رێزترین دروستكراوی خوا و گه‌وره‌ی ئه‌م زه‌مینه و جێنشینی خودا له زه‌ویدا ده‌زانێت.

گوێڕایه‌ڵی په‌روه‌ردگار و به‌دیهێنه‌ری ده‌كات و فه‌رمانه‌كانی جێبه‌جێده‌كات، به‌مه‌ش شه‌ره‌فو گه‌وره‌یی و شكۆمه‌ندیی هه‌میشه‌یی وه‌ده‌ستده‌هێنێت كه جیهان له دێرزه‌مانه‌وه له‌مه بێبه‌شی كردبوو.

## ده‌نگدانه‌وه‌ی عه‌قیده‌ی یه‌كتاپه‌رستی له جیهاندا و كاریگه‌ریی له‌سه‌ر ئایینه‌كان

ئه‌وه فروستاده‌یی موحه‌مه‌دییه، كه ئه‌م دیارییه گرانبه‌ها ده‌گمه‌نه‌ی ـ عه‌قیده‌ی یه‌كتاپه‌رستی ـ پێشكه‌ش به مرۆڤایه‌تی كرد، كه ئه‌م عه‌قیده‌یه زیاتر له هه‌ر عه‌قیده‌یه‌كی دیكه له‌م جیهانه‌دا نادیار و نه‌ناسراو و سته‌ملێكراو بوو، پاشان بوو به سه‌دایه‌ك كه سه‌رتاپای جیهان ئه‌م سه‌دایه‌ی ده‌گوته‌وه، سه‌رجه‌م فه‌لسه‌فه و بانگه‌وازه جیهانییه‌كان ـ كه‌م، یان زۆر ـ پێی كاریگه‌ر بوون.

هه‌ندێك له‌و ئایینه گه‌ورانه‌ی، كه له‌سه‌ر هاوبه‌شدانان (شرك)و فره‌په‌رستراوێتی بنیاتنرابوون‌و ئه‌م فره‌په‌رستراوییه تێكه‌ڵی خوێن و گۆشتیان بووبوو، ناچار بوون له كۆتاییدا دان به‌وه‌دا بنێن ـ ئه‌گه‌رچی به‌ده‌نگێكی نزم، یان به چپه‌یه‌ك ـ كه خودا تاك و ته‌نهایه و هیچ هاوبه‌شی نییه و ناچار بوون باوه‌ڕه شیركییه‌كانیان به لێكدانه‌وه‌یه‌كی فه‌لسه‌فی

ئەوتۆ لێکبدەنەوە، کە قووتاری بکەن لە تۆمەتی شیرك و بیدعە و وای لێبکەن بشوبهێتە عەقیدەی یەکتاپەرستی ئیسلام.

پیاوانو کاهینەکانی ئەو ئاییننانە هەستیان بە شەرمو خەجاڵەتی دەکرد لە داننان بە شیرکو باسکردنی، هەموو ئەم سیستمە هاوبەشدانەرانەش تووشی (گرێی خۆبەکەمزانین، مرکب النقص) **(Inferiority Complex)** و هەستکردن بە زەلیلی و سووکی بووبوون.

ئەم دیارییە ـ عەقیدەی یەکتاپەرستی ـ بەنرخترین دیاری بوو، کە مرۆڤایەتی لە سایەی ڕەوانەکرانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) بەختەوەر و کامەران کرد.

بەڕاستی مامۆستامان زانای پایەبەرز سەید سلێمانی نەدوی ئەم ڕاستییە عەقیدەی و سایکۆلۆجییە و کاریگەریی لەسەر پەروەردەی مرۆڤ و ئاڕاستەکردنی مەدەنیەتدا زۆر بە باشی خستۆتە ڕوو، لە کتێبە گەورە و بەناوبانگەکەیدا (ژیانی پێغەمبەر = سیرە النبی)ـدا دەڵێت:

(ئەو گەلانەی کە ئاشنایەتییان لەگەڵ عەقیدەی یەکتاپەرستیدا نەبوو، زۆر بە ئەستەم مانای مرۆڤایەتیش دەزانی، خۆیان بە کۆیلەیەکی ملکەچی هەموو دیاردەیەك لە دیاردەکانی هێز (مظاهر القوة) هەژمار بکەن، ئەو عەقیدە یەکتاپەرستیەی کە موحەممەدی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) هێنای، ئەو عەقیدەیەیە توانی مرۆڤ لە هەموو ئەو ترسانەی کە هەست و نەستەکانی دادەگرت، ڕزگار بکات، هەر بە هۆی فەزڵی ئەم عەقیدەیەوە وایلێهات جگە لە خودا، لە کەس نەدەترسا.

هەموو ئەو شتانەی کە پێشتر دەیپەرستو بەسەرچاوە، یان نموونەی هێزی زاڵو چالاکی دادەنا، ملکەچی مرۆڤ بوونو تەسخیری دەکردن بۆ

سوودو بەرژەوەندییەکانی خۆی، وەکو: خۆر، زەمین، ڕووبارو دەریاو... هتد.

هەموو ترس و بیمێکی پاشایەتی و شکۆمەندی حاکمییەتی نەوەی مرۆڤـ لەلای ڕەویەوە و خواوەندەکان (آلهة)ـی بابل و میسر، خواوەندەکانی هیند و ئێران و (ئەوەی دەیگوت: أنا ربکم الأعلی، واتە: (من پەروەردگاری هەربەرزی ئێوەم) وەکو خزمەتکارێکی مرۆڤو چاودێری بەرژەوەندییەکانیو پاسەوانی سامانەکانی نەبێت، دەرنەدەکەوتن. واتە (لەوەوپێش مرۆڤ خۆی و سەروەت و سامانی دەخستە خزمەت ئەو پەرستراوانە، بەڵام دواتر بەهۆی عەقیدەی یەکتاپەرستیەوە مرۆڤ ئەو بتانەی کرد بە خزمەتکاری خۆی و سەروەت و سامانەکانی) [1].

خواوەندە پووچەڵەکان ئیتر پاشاکانیان دانەدەنا و لایانببەن، بەڵکو مرۆڤ بوو کە پاشاکانی بەرز، یان نزم دەکردەوە. کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کاتێك، کە ملکەچی حوکمی خواوەندە درۆینەکان بوو، کۆمەڵگەیەکی گەندەڵ و پارچە پارچە و پەرتەوازە بوو، دابەش بووبوو بۆ چەندەها چین و توێژ، کە چەندین نەریتی ستەمکارانە حوکمی دەکرد، مرۆڤی دابەش دەکرد بۆ شەریف و گەورە و پلە نزم و کەم، ئەمەیان سەر بە چینێکی بەرزە و ئەوەیان سەر بە چینێکی نەوییە، ئەوە (بەرمیشور = گەورەی خواوەندەکانی هیند) لەسەری خۆی دروستی کردووە، بۆیە شەریف و خزمەتکراوە و ئەوی دیکەیان لە قاچی دروستی کردووە، بۆیە نزم و خزمەتکارە، یەکێکی دیکە لە دەستی خواوەندی گەورە دروستکراوە، بۆیە پێویستە لەنێو خەڵکیدا لە چینی ناوەند بێت، شتێکی سروشتی بوو لە

---

[1] ئەمە روونکردنەوەی خۆمە (طاهر)

دەرەئەنجامی ئەم عەقیدەیەوە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەوکات دابەش بوویێت بۆ چەند تایەفە و چینێك و بەپێی چەند نەژاد و رەچەڵەکێك، بێئاگا بوو لە سادەترین مانای بنەمای یەکسانی مرۆیی و بەرز و بڵندی مرۆڤانە و دەستخستنی مافەکان بە یەکسانی، دونیا ئەوکاتە تەنها مەیدانێك بوو بۆ ناکۆکی و خۆهەڵکێشانی گروپ و چین و توێژەکان.

کاتێك ئیسلام هات هەموو تاریکییەکانی ڕەواندەوە و بۆ یەکەمجار خەڵکی عەقیدەی یەکتاپەرستییان ناسی و برایەتی مرۆڤایەتییان زانی، کە درزەکانی کوێر کردەوە و پێودانگە دەستکردەکانی لابرد، بەم عەقیدەیە مرۆڤ دەرکی بەوە کرد کە تا چەند مافی یەکسانی لێزەوتکرابوو، مێژووش باشترین شاهیدە، کە تا چەند ئەم عەقیدەیە دەرئەنجامی ئیجابی و چالاکانەی هەیە، هەروەها تا چ مەودایەکیش کاریگەریی لە سەر عەقڵییەتی ئەو نەتەوە و گەلانە هەیە کە – بەخۆشی، یان ناچاریی – دانیان بە فەزڵی ئەم عەقیدەیەدا ناوە، هەرچەندە هێشتا بێئاگان لە هەموو ماناکان و نفوزی واقیعی ئەم عەقیدەیە لە گۆڕینی پێوەرەکاندا.

ئەو گەلانەی کە باوەڕیان بە بنەمای یەکتاپەرستی نییە، هەتا زەمانی ئێستاشمان بنەمای ڕاستەقینەی یەکسانی مرۆڤایەتی لەدەستدەدەن، دیاردەکانی ئەم نایەکسانییە بە تەنها لە کۆڕ و کۆمەڵیاندا نابینرێت، بەڵکو تەنانەت لە پەرستگاکانیشدا دەبینرێت، کە پێشەواکانیان خەڵکی بە پێی پلە و پایەکانیان (کە پێیدەڵێن پرۆتۆکۆڵ) ، دابەش دەکەن.

گومانی تێدا نییە مسوڵمانان لە باشیدان بە فەزڵی باوەڕبوونیان بە تاك و تەنهایی خودای بەرزی بەتواناوە، چونکە ئەم بنەمایەیان لە ١٣ سەدە پێش ئێستاوە ناسیووە، ڕزگاریان بوو لە هەموو پێوەرە دروستکرا و و

ئاسته دانراوەکان، خەڵکی بەلای ئیسلامەوە وەك دانەکانی شانە یەکسانن، نە ڕەنگ و نە نیشتمان جیاوازیی ناخاتە نێوانیانەوە و نە نەتەوایەتی و نە نیشتمانپەروەریی لێکیان جیاناکاتەوە، لەبەردەم پەروەردگاریاندا ـ بە یەکسانی ـ کڕنووش دەبەن بە زەلیلی و گەردنکەچی، ئەگەر لە ژیانیاندا مامەڵە لەگەڵ یەکدی بکەن، هەموو بەڕێز و یەکسانن، هیچ جیاوازی نییە لەنێوانیاندا بە ئیمان نەبێت و هیچ کامێکیان فەزڵی بەسەر ئەوی دیکەوە نییە بە کرداری باش نەبێت (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ) (الحجرات:١٣)...) [١] .واتە: (بەڕێزترینتان بەلای خواوە پارێزکارترینتانە).

## کاریگەریی یەکتاپەرستی ئیسلامیی لە سەر هیند

لێکۆڵەری ناسراوی هیندی (K.M.Panikkar) لەکاتێکدا دەربارەی کاریگەریی عەقیدەی یەکتاپەرستی ئیسلامی لەسەر عەقڵیەتی گەلی هیندی و ئایینەکانی دەدوێت، دەڵێت:

( ڕوون و دیارە: کە کاریگەریی ئیسلام لەسەر دیانەتی هیندۆکی زۆر قووڵ بوو لەم سەردەمە ئیسلامییەدا، بیرۆکەی پەرستنی خودا لەلای هیندییەکەکان قەرزاری ئیسلامە، سەرانی فیکر و ئایین لەم سەردەمەدا ـ هەرچەندە چەندین ناویان لە خواوەندەکانیان نابوو ـ بانگەوازیان دەکرد بۆ پەرستنی خودا و بەڕاشکاوی ڕایانگەیاند، کە پەرستراو تاك و تەنهایە و شایستەی پەرستنە و داوای ڕزگاربوون و کامەرانی لەو دەکرێت، ئەم کاریگەرییە لەو دیانەت و بانگەوازانەدا دەرکەوت کە لە سەردەمی

---

[١] السيرة النبوية للعلامة السيد سليمان الندوي ج٤ / ص ٥٢٣ – ٥٢٤ ئەم پارچەیەش لە وەرگێڕانی ( دکتور عبدالله عباس الندوی)یە.

ئیسلامییدا له هیندستان سەریانهەڵدا، وەك دیانەتی (Bhagti) و بانگەوازی (داس) [٢] ی گەورە) [٣].

هەروەها حاڵی ئەو گرووپەی که ناوی (سیخ = sikhs)یان لەخۆ ناوه هەر بەهەمان شێوەیە، ئەو گرووپەی که ڕۆڵێکی مەترسیداری له بواری سیاسی و سەربازی و کۆمەلایەتی له کۆمەڵگەی گشتیی هیندوسیدا، گێڕا.

ئەوەی سەلمێنراوه له مێژووی ئەم دەستەیەدا، ئەوەیە، که مەبەستی سەرەکی له سەرهەڵدان و پەیدابوونی ئەم مەزهەبه له دیانەتی هیندۆکیدا بۆ پاککردنەوەی بیروباوەڕە ئاینییەکان بووه، دامەزرێنەکەشی (بابا نانەك) بوو، که کاریگەر بوو به ڕێنماییەکانی ئیسلام و خوێندن و دیراسەی له زمانی فارسی و ئاییندا لەلای پیاوێکی مسوڵمانی ناسراو به چاکه بووه، ناوی (سەید حەسەن) بوو، جێگەی چاودێری و بایەخ و سوزی ئەم مامۆستایەی بووه.

ناوی هەندێکی دیکه له مامۆستا مسوڵمانەکانی براوه، که ژمارەیان دەگاته شەش کەس، گێڕدراوەتەوه که سەردانی مەککه و مەدینەی کردووه و چەند ڕۆژێك له بەغدا ماوەتەوه و پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ (شێخ فەرید) دا هەبووه که گەورەی شێخانی تەریقەت بووه له (بنجاب)، (بابا نانەك) له بانگەواز و فێرکردنەکەیدا تەرکیزی دەکردە سەر عەقیدەی یەکتاپەرستی و یەکسانی ئینسانی و خۆ دوورگرتن له بت و بتپەرستی [١].

---

[٢] شاعیرێکی سۆفی یە، ڕەخنه له کۆمەڵگەی هیندی دەگرێت و بانگ بۆ چاکسازی دەکات، خەڵکیش دەربارەی دیانەتی ڕاجیان.

[٣] A Survey of Indian History , P.١٣٢ .

[١] بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر بگەڕێوه بۆ: Macauliffe: The sikh , Religion seve

Ram Siungh: Life of Guru Nanak

هەروەها (d.r tarachand) لە کتێبەکەی (کاریگەری ئیسلام لەسەر کەلتووری هیندی Influence of Islam on India culture) خوێنەر حەواڵە دەکات بۆ لای کتێبی ئایینی هیند ( Religion of India) کە هی (Barith)ـە:

(ئەوەی پێویستە دووپاتی بکەینەوە ئەوەیە: قوتابخانە ئایینی و فەلسەفییەکانی خوارووی هیند هەمووی وەك یەکەیەکی وەرگیراو بوون لە سیستمە فکرییەکانی کۆن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی، یان تەرجیحاتی تایبەتەوە ئاوێنەیەك بوون بۆ کاریگەری ئیسلامی، ئەمەش وا دەکات کە شتێکی مەعقول بێت و بووترێت بە ئیسلام کاریگەر بووبوون) [٢] .

## کاریگەریی عەقیدەی یەکتاپەرستی لەسەر جیهانی مەسیحی

مامۆستا ئەحمەد ئەمین دەڵێت: (ڕەوتێك لە نێو دیانەکان (النصاری)دا دەرکەوت کاریگەریی ئیسلامی پێوە دیار بوو، لەوانە: لە سەدەی هەشتەمی زاینیدا، واتە لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچیدا لە سەپتیمانیا [١] (Septimania) بزووتنەوەیەك سەری هەڵدا بانگەوازی دەکرد بۆ ڕێگرتن لە دانپێدانان لە بەردەم قەشەکاندا [٢] و قەشەکان مافیان لەوەدا نییە خۆ

---

[٢] لاپەڕە ١٠٧ی سەرچاوەی ناوبراو.

[١] سەپتیمانیا: هەرێمێکی کۆنی فەرەنسیە لە باشووری خۆراوای فەرەنسادا لە سەر ڕۆخی دەریای سپی ناوەڕاست.

[٢] هەر مەسیحیەك کە تاوان و گوناهی کردبێت، بۆی نییە ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوە بۆ لای خودا و تۆبە بکات، بەڵکو دەبێت بچێتە لای پیاوێکی ئایینیو دان بە هەموو تاوانو گوناحەکانی دابنێت تاوەکو ئەو داوای لێخۆشبوونی لە خودا بۆ بکات، ئەمەش زۆر جار کاری ئابڕووبەرانەی لێدەکەوتەوە، بەتایبەت کاتێك ئافرەتی گوناهکار دەچوو لە پێش کابرای (قەشەدا) دانی بە گوناهەکانیدا دەنا، بە تایبەت سەرپێچی سێکسی، جا لە باتی ئەوەی

تێهەڵقورتێنن، بەڵکو دەبێت مرۆڤ خۆی لە خودا بپاڕێتەوە بۆ لێخۆشبوون لەو تاوانەی کە ئەنجامی داوە، ئیسلام قەشە و روهبان (عابیدی مەسیحی) و ئەحبار (زانایانی جوولەکە)ی نییە، بۆیە زۆر سروشتییە، کە بەزمی دانپێدانانی تێدا نەبێت. (بەڵکو هەر کەسە و خۆی ڕاستەوخۆ ڕوو دەکاتە خودا و داوای لێبووردن و لێخۆشبوونی لێدەکات لەو تاوانانەی ئەنجامی داوە). [٣]

(هەروەها بزووتنەوەیەکی دیکە هەبوو بانگەوازی بۆ تێکشکاندنی وێنە و پەیکەرە ئایینیەکان (Iconoolast) دەکرد، ئەویش: لەبەر ئەوەی لە سەدەی هەشتەم و نۆیەمی زایینیدا، یان سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی، مەزهەبێکی دیانی (نصرانی) سەریهەڵدا بە پیرۆزڕاگرتنی وێنە و پەیکەرەکانی ڕەتدەکردەوە، بۆیە ئیمپراتۆڕی ڕۆمانی (لیۆ)ی سێیەم، ساڵی ٧٢٦ز بڕیارێکی دەرکرد، تەقدیسکردنی وێنە و پەیکەرەکانی حەرام دەکرد، لە ساڵی ٧٣٠ز، فەرمانێکی دیکەی دەرکرد، ئەو بەپیرۆزڕاگرتنە بە بتپەرستی (وثنیة) دادەنا، هەروەها قوستەنتینی پێنجەم و (لیۆ)ی چوارەمیش هەر وا بوون، ئەمە لەکاتێکدا پاپا (گریگۆری) دووەم و سێیەم و جەرمانیوس پەتەریارکی قوستەنتینییە (ئەستانبوولی ئێستا) و ژنە ئیمپراتۆر (الإمبراطورة) (ئێرینی) لە پشتیوانانی پەرستنی وێنەکان بوون، لە نێوان هەر دوو دەستەکەدا ناکۆکییەکی توند ڕوویدا، کە ئێرە جێگەی درێژەی ئەو باسە نییە، هەموو ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێت باسی بکەین

---

(قەشەکە) داوای تۆبەی بۆ بکات، هەوڵی دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەتەکە دەدا. بڕوانە: المسيحية أحمد شلبي:٢٥٦ (( طاهر)).

[٣] ئەم زیادەیە قسەی خۆمە. ( طاهر).

ئەوەیە هەندێك لە مێژوونووسان باسی دەکەن: بانگکردن بۆ وەلانانی وێنەو پەیکەرەکان بەهۆی کاریگەری ئیسلامەوە بوو، دەڵێن: کلۆدیوس (Claudius) ئەسقوفی تورین (کە لەساڵی ٨٢٨ز و نزیکی ٢١٣ك دانرا) وێنە و خاچەکانی دەسووتاند و ڕێگریی لە پەرستنیان لە کەنیسەکەیدا دەکرد، شایانی باسە ئەم پیاوە لە ئەندەلوسی ئیسلامی لەدایك بووە و گەورە بووە، بوغزاندنی ئیسلامیش بۆ پەیکەر و وێنەکان شتێکی زانراوە.

بوخاری و موسلم لە عائیشەوە خوای لێڕازی بێت، دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لەسەفەرێك هاتەوە، منیش بەپەردەیەك تاقێکم داپۆشی بوو، پەردەکە وێنەی چەند پەیکەرێکی تێدابوو، کاتێك بینی پەردەکەی دڕی و ڕەنگی دەمووچاوی گۆڕا و فەرمووی: ئەی عائیشە، ئەو خەڵکانەی کە توندترین سزایان هەیە لە ڕۆژی دواییدا ئەوانەن کە هاووێنەی دروستکراوەکانی خودا دروست دەکەن، ئەمجا عائیشە فەرمووی: ئێمەش پەردەکەمان دڕاند و سەرینێك، یان دوو سەرینمان لێدروستکرد). فەرموودەکانیش لەم بارەوە گەلێك زۆرن.

هەروەها گروپێك لە دیانەکان[١] پەیدا بوون عەقیدەی (سیانە = تثلیث)[٢]، یان وا ڕاڤە دەکرد نزیکدەبێتەوە لە یەکتاپەرستی و ئینکاری خوایەتی (مەسیح =عیسی)ـیان (سەلامی خوای لەسەر) دەکرد)[٣].

---

Haines's, Christianity & Islam in Spain, P. ١١٦. [١]

[٢] عەقیدەیەکە بەلای نەصرانییەکانەوە، بە پێی ئەم عەقیدەیە خودا –تعالی الله عن قولهم– لە سێ کەس، یان سێ زاتی سەربەخۆ پێکدێت کە خودای باوك (واتە: الله) و خودای کوڕ، مەبەستیان عیسای کوڕی مەریەمە (علیهما السلام) و خودای روح القدس. پێیانوایە هەرسێکیان لە ئەزەلییەت و جەوهەری ئولوهییەت و قودرەتدا یەکسانن، بەڵام لە بوونیاندا جیاوازن، چونکە خودای ئاب (الله) هەر بووە و وجودی خۆی لە کەس وەرنەگرتووە، بەڵام

دەگونجیَ بۆ هەرکەسێك کە مێژووی ئاینیی ئەوروپا و مێژووی کەنیسەی دیانی (نصرانی) بخوێنێتەوە درك بە کاریگەریی ئیسلام بکات لە ڕووی عەقڵیەوە لەسەر ڕەوتی چاکخوازان و شۆڕشکاران دژ بە سیستمی باوی کەنیسە.

بانگەوازە چاکسازییەکەی (لوثر)[1] ، کە لە سەدەی شازدەی زایینی سەری هەڵدا، ڕەنگدانەوەیەکی لاوازی ڕێنماییەکانی ئیسلام و ڕۆڵی لەچاکسازییدا تیادا دەرکەوت، وەك چۆن تیشکدانەوەی ڕووناکییەك لە شوێنێکی دوورەوە چەند پەردەیەکی چڕوپڕی ڕێگر دەبڕێت.

**یەکەم:** بەهۆی ملکەچیی عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ نەریتە کۆنەکان و فشاری کەنیسە، وەك نووسەری مەسیحی (J.Bass Mullinger)[2] دەڵێت.

---

خودای کوڕ بوونی خۆی لە خودای ئابەوە وەرگرتووە و خودای (روح القدس)یش بوونی خۆی لە هەردووکیانەوە وەرگرتووە، دەڵێن ئەمە نهێنییەکە نابێت هیچ نەصرانییەك قسەی تێدا بکات و لێی بکۆڵێتەوە، چونکە تەنانەت زاناکانیشیان ناتوانن لێی تێبگەن و وەحدانییەت و (تثلیث) پێکەوە کۆبکەنەوە.

بروانە: ( الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة٢/١٠٠٠، والنصرانية من التوحيد الى التثليث:٢٠٩-٢١٠، ومحاضرات في النصرانية: ١٠٢).(طاهر)

[3] ضحى الإسلام بەرگی ١، لاپەڕە ٣٦٤ – ٣٦٥.

[1] مارتین لۆثر (١٤٨٣-١٥٤٦ز): راهیب و نووسەر و بیرمەندێکی مەسیحییە، لە ئەڵمانیاوە دەستی کرد بە چاکسازی ئایینی (پرۆتستانت) و لە ساڵی(١٥١٧) لە کەنیسەی کاسۆلیکی جیابووەوە و لە دژی دەسەڵاتی پاپا و چەکی (لێخۆشبوون = غفران)و ڕەبەنیی... وەستایەوە. تەوراتی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵمانیی، ئەمەش بە ڕووداوێکی گرنگی ئایینی و ئەدەبی دانرا. بروانە: المنجد فی الأعلام: ٤٩٥. (طاهر).

[2] بگەڕێوە بۆ (دائرة المعارف البريطانية) و وتارەکەی (جەی باس مولنجەر) دەربارەی (مارتن لۆثر).

**دووەم:** لەبەر بەهێزی دەسەڵاتی پۆڵس (١٠– ٥٦پاش زاین) لەسەر مەسیحیەت و ڕامکردنی بۆ بیروڕا و ڕاڤەکانی، کە بۆعەقیدەی مەسیحیەتی دەکرد.

وەك ئەرنست دی بونسن Ernest (de Bunsen)[٣] دەڵێت: پڕۆتستانتی کە (لوثر) ڕێبەرایەتی دەکرد زۆرێك لە بیروڕای ئازادیخوازانە لە کاروبارەکانی ئایینی و دنیایی لەخۆدەگرێت، هەروەها لە ئازادیدان بە تاك لە هەڵسەنگاندن و حوکمدان بەسەر شتەکاندا و لێبوردەیی ئاینیدا (التسامح الدینی)، ئەمەش دژایەتیکردنی لاساییکردنەوە و دەسەڵاتی ئایینیە، کە لە کاسۆلیکی دا هەبوو، کرۆك و رۆحی پڕۆتستانیەت بریتییە لە بەرپرسیارێتی تاك لە بەرامبەر خودادا، نەك لە بەرامبەر کەنیسەدا.

---

(٣) **تەماشای کتێبی** ( Islam or true Christianity )

## بۆچی ئەم هەوڵانە شکستیان هێنا و ئەنجامی خوازراویان بەدەستنەهێنا؟

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ڕاستییەکی هەمیشەیی بکەین، کە مێژووی ئایینەکان سەلماندوویەتی و نەفسیەتی نەتەوە و گەلان بڕیاریان لێداوە، ئەویش ئەوەیە: بزاڤی چاکسازی ڕیشەیی شۆڕشگێڕانە لە ئایینەکاندا تووشی دەستکارییکردن و لادانی ڕیشەیی هاتوون ـ هەرچەندە ئەو کەسانەی پێیهەڵساون و بانگیان بۆ کردووە گەشتبنە ڕادەیەکی بەرزی دڵسۆزی و هەوڵدان ـ ئەگەر ئەم بزاڤانە بە ڕوونی و تەواوەتی خۆیان جودا نەکردبێتەوە لەو ئایینە لادەر و دەستکاریکراوانە (الديانات المنحرفة أو المحرّفة) و خۆیان لێ بەریی نەکردبێت و بەتێکەڵی مابێتنەوە لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵگە گەورە ئایینیەی، کە ویستوویانە چاکسازی تێدا بکەن و گۆڕانکاری لە عەقیدە سەرەکی و بنەڕەتییەکانیدا بکەن، چونکە بە ناچاری دەستیانگرتووە بە بنەمای لێبوردەیی (التسامح)ەوە، سەرەنجامی ئەم تاقمو بانگەوازانە لە کۆتاییدا توانەوە بووە لەم ئایینانەدا، کە ویستوویانە چاکسازی تێدا بکەن و هەموو هەوڵ و کۆششەکان، کە سەرکردەی ئەم بزووتنەوە چاکسازییخوازانە پێیهەستاون، بەفیڕۆچوون.

حاڵی بزووتنەوە شۆڕشگێرییەکان لە ئایینی مەسیحیدا و بزووتنەوەکانی بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی و یەکسانی مرۆڤایەتی کە لە هینددا سەریانهەڵدا، پێشتر باسمانکردن هەروا بوو.

هەر لەبەر ئەوەیە هەڵوێستی پێغەمبەرانی پێشین و هەڵوێستی ئایینی ئیسلامی زۆر ڕوون و ڕاشکاوانە بوو، هیچ تێکەڵی و نادیارییەکی تێدا نەبوو، هەڵوێستێکی بەهێز کە هیچ لاوازیی و دوودڵییەکی تێدا نەبوو، ئەمەش بە

جوانی له فەرمایشتەکەی گەورەمان ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر) و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵیدا بوون، دەردەکەوێت، کە بە موشریکەکانی سەردەمی خۆیان گوت، قورئانیش بۆمان دەگێڕێتەوە:

(قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلاَّ قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ) (الممتحنة:٤).

واتە: (سەرمەشقییەکی چاکتان بۆ هەیە، لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون، کاتێك بە گەلەکەیان وت: ئێمە (بەری)ـن لە ئێوە و لەوانەش کە دەیانپەرستن لە غەیری خودا، باوەڕتان پێناکەین و بۆ هەمیشە دوژمنایەتی و ڕق و کینە لە نێوانماندا سەریهەڵدا هەتا باوەڕ بە خودای تاك و تەنها دێنن، تەنها لەوەدا ئیبراهیم مەکەنە سەرمەشق کە بە باوکی وت: داوای لێخۆشبوونت لە خودا بۆ دەکەم ـ واتە: داوای لێخۆشبوون بۆ کەسێك مەکەن کە بەکافری مردبێت ـ وە من دەسەڵاتی هیچ شتێکم نییە بۆت لەلای خودا، ئەی پەروەردگارمان: ئێمە پشتمان تەنها بە تۆ بەست و بۆ لای تۆ گەڕاینەوە ـ لە دونیادا ـو گەڕانەوە و سەرەنجامی دوای مردنیش هەر بۆ لای تۆیە).

ئەم هەڵوێستە تایبەت نەبوو بە سەردەمێك، یان کۆمەڵگەیەکەوە، بەڵکو ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر) وەسێتی بۆ شوێنکەوتووانی کرد و لە دوای خۆی بەجێیهێشت، قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە: (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاء مِّمَّا تَعْبُدُونَ، إِلاَّ الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ، وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) (الزخرف: ٢٦: ٢٨ ).

واتە: (ئەو کاتە وەبیربهێنەوە ـ ئەی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر) ـ کە ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت: من (بەری)م لەوانەی کە ئێوە دەیپەرستن، جگە لەو خوایەی کە دروستی کردوم و وەدیهێناوم و هەر ئەویش ڕێنماییم دەکات و ڕێگەی ڕاستم نیشان دەدات، ئەم بەرییکردنە لە هەرچی پەرسترا و هەیە، جگە لە خودای پەروەردگار، کە هەمان مانای ڕستەی شایەتمانی هەیە ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر) وەسیەتی بۆ نەوەکانی و شوێنکەوتووانی کرد کە دەستی پێوە بگرن و لەسەری بڕۆن، تا بەڵکو بۆ لای خوا بگەڕێنەوە).

جا بە هۆی ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەران و ئاینی ئیسلام ـ کە پێشتر باسمان کرد ـ ئیسلام بە ئاینێکی ڕوونی دیارییکراو مایەوە و ڕۆح و ڕێنماییەکانی پاراستووە تا ئەم ساتەوەختە: (لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ) (الأنفال: ٤٢).

(تا هەر کەسێك کە تیادەچێت و دەمرێت لەسەر بەرچاوڕوونی تیابچێت و هەرکەسێکیش دەژی و دەمێنێتەوە هەر لەسەر بەرچاوڕووونی بژی و بمێنێتەوە، یاخود هەر کەسێك کە باوەڕ ناهێنێ و کافر دەبێت، با لەسەر بەرچاوڕوونی بێت، واتە دوای ئەوەی خودا ڕێگەی ڕاستی بۆ ڕوون کردبێتەوە، هەرکەسێکیش کە ئیمان دەهێنێت با لەسەر بەرچاوڕوونی بێت).

## ڕاگەیاندنێکی مێژوویی مەزن دەربارەی برایەتی ئینسانی

شاکاری مەزنی پێغەمبەری مرۆڤایەتی و چاکەی هەمیشەیی و بەربڵاو بە هەموو جیهاندا، بریتییە لە دیدی یەکێتی مرۆڤایەتی (واتە مرۆڤەکان لە بنەڕەتدا وەك یەکن).

مرۆڤ پێشتر دابەش بوو بوو لە نێوان هۆز و نەتەوە و چین و توێژەکاندا، هەندێکیان کەمتر بوون لە هەندیکیان و، دابەش بوو بوون بۆ نەتەوایەتی تەسك و بەرتەنگ.

جیاوازیی نێوان چینێك بۆ چینێکی دیکە زۆر گەورە بوو، بە قەدەر جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ و نێوان ئازاد و کۆیلە و نێوان بەندە و پەرستراوەکەی، هیچ بیرۆکەیەك دەربارەی یەکبوون و یەکسانی نەبوو.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە دوای چەند سەدەیەکی دوور و درێژ لە بێدەنگییەکی بێسرکە و لە دوای تاریکییەکی بەربڵاو، ڕایگەیاند، ئەو ڕاگەیاندنە شۆڕشگێڕییەی عەقڵەکانی سەرسام کرد و بارودۆخەکەی گۆڕی: (أيها الناس: إن ربكم واحد وإن أباكم واحد، كلكم لآدم، وآدم من تراب، إن أكرمكم عند الله أتقاكم، وليس لعربي على أعجمي فضلٌ إلاّ بالتقوى)[1] .

---

[1] كنز العمال ٣/ ١٢٣٧ (٨٥٠٢).

ئەمە بەشێکە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە لە (حجة الوداع )دا فرموویەتی و لەفزەکەی بەم شێوەیە: ((يا أيها الناس إن ربكم واحد وأباكم واحد، ألا لا فضل لعربي على عجمي ولا لعجمي على عربي ولا أسود على أحمر ولا أحمر على أسود إلا بالتقوى )). قال الهيثمي: رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح. مجمع الزوائد ٥٨٦/٣ (برقم ٥٦٢٢)، شێخ ئەلبانیش (بەڕەحمەت بێت) لە (السلسلة الصحيحة و تخريج شرح الطحاوية ) بە صەحیحی داناوە. (طاهر)

واتە: (ئەی خەڵكینە: پەروەردگارتان یەكە و باوكیشتان كە ئادەمە، یەكە، هەمووتان لە ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزكارترینتانە (تەقوادارترینتانە) هیچ عەرەبێك زیادە گەورەییەكی بەسەر عەجەمییەكەوە (غەیری عەرەب) نییە بە لەخوا ترسان نەبێت).

ئەم ڕاگەیاندنە لە خۆیدا دوو ڕاگەیاندن لەخۆدەگرێت، كە هەردووكیان ئەو دوو كۆڵەكەیەن كە ئاسایش (الأمن) و ئاشتی (السلام)یان لەسەر ڕادەوەستێت و لەهەموو كات و شوێنێكدا ئاشتی لەسەر ڕاوەستاوە، ئەو دوو كۆڵەكەیە: یەكبوون لە پەروەردگاریدا و یەكبوون لە مرۆڤایەتیدا، مرۆڤ برای مرۆڤە لە دوو ڕووەوە، مرۆڤ دوو جار برای مرۆڤە، جارێكیان كە بنەڕەتە، لەبەر ئەوەیە كە پەروەردگاریان یەكە، جارێكی دیكەش لەبەر ئەوەیە كە باوكیان یەكە: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا) (النساء: ١).

واتە: (ئەی خەڵكینە، لە پەروەردگارتان بترسن، ئەو زاتەی دروستی كردوون لە تاكە كەسێك كە ئادەمە و هەر لەو تاكەكەسەش هاوسەرەكەی دروستكردووە، لە هەردووكیشیانەوە پیاو و ژنی زۆری بەسەر زەویدا بڵاوكردەوە، لەو خوایەش بترسن كە بە ناوی ئەوەوە داوا لە یەكدی دەكەن ـ ئەڵێن لەبەر خوا فلان كارم بۆ بكە ـ و پارێزگاری لە خزمایەتی و سیلەی ڕەحم بكەن، بێگومان خودا بەسەرتانەوە چاودێر و ئاگادارە).

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) ( الحجرات: ١٣).

واتە: (ئەی خەڵکینە ئێمە لە نێرێك و مێیەك دروستمان کردوون و لەو دووانەوە کردوومانن بە چەند گەل و تیرەیەك تا یەکدی بناسن، نەك بۆ ئەوەی گاڵتە بەیەکدی بکەن و ناکۆك بن لەسەر ڕەنگ و نەژادی جیاواز، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا بە تەقواترین و پارێزکارترینتانە، بەڕاستی خودا زانا و ئاگادارە) [١] .

پێغەمبەری خوداش (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: (إنَّ الله أذهب عنكم عصبية الجاهلية، وفخرها بالآباء، إنما هو مؤمن تقي، أو فاجرٌ شقي، الناس بنو آدم، وآدم خلق من تراب، لا فضل لعربيٍّ على أعجميٍّ إلاّ بالتقوى) [٢]

واتە: (خودای گەورە ــ بەهۆی ئیسلامەوە ــ دەمارگیریی جاهیلیەت و خۆهەڵکێشانی جاهیلیەتی بە باب و باپیرانەوە لەکۆڵ کردوونەتەوە و مرۆڤەکان دابەشبوون بۆ: ئیمانداریکی بە تەقوا، یان خراپەکارێکی نالەبار، هەموو خەڵکی نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵ دروستکراوە، هیچ

---

[١] دەبێت ئەوەش بڵێین کە هەر کەسێك بە تەقوا بێت، بە لای خواوە بەڕێزە و هەر کەسێکیش خودا ڕێزی لێبگرێت دەبێت ئیمانداران ڕێزی لێبگرن، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هەر کەسێك هەندێك چاکەی هەبێت خۆی لێبگۆڕێت و بڵێ: من بە تەقوام، ئنجا مننەت بە سەر خەڵکدا بکات و خۆی هەڵبکێشێت و خۆی بە چاکتر بزانێت لە مسوڵمانانی دیکە، بەڵکو دەبێت لەوە بترسێت کە نەوەك خودا بەهۆی ئەم خۆهەڵکێشانەوە چاکەکانی ڕەتبکاتەوە و لێیوەرنەگرێت، هەر کەسێك بگاتە پلەی تەقوا، ئەوا هەمیشە ڕێز لە بەندەکانی خودا دەگرێت و تەوازوعی زیاتر دەنوێنێت و چاوەڕوانی پاداشت لە خودا دەکات و فەخر و شانازی بەسەر بەندەکانی خوداوە ناکات. (طاهر)

[٢] رواه الترمذي وغيره عن النبي (ﷺ).

(حديث حسن) بڕوانە صحيح الجامع الصغير (برقم ٧٨٦٧). بەڵام لەبری وشەی (عصبية) وشەی (عبيّة) هاتووە. (طاهر)

عەرەبییەك فەزڵی بەسەر عەجەمییەكەوە ـ غەیری عەرەبەوە ـ نییە بە تەقوا و پارێزكاری نەبێت).

هەر لەبەر ئەم بنەمای یەكسانییەیە، كە ئیسلام مافێكی پەخشكراو (مشاع)ـەو سەروەتێكی هاوبەشی هەموو نەتەوە و گەلان و توخم و ڕەگەزەكان و خێزان و بنەماڵەكان و وڵات و نیشتمانەكانە، قۆرغكاری تێدا نییە، وەك قۆرغكاری نەوە و وەچەكانی (لاوی) لە نێو جوولەكەدا، یان قۆرغكاری (براهماییەكان) لە ناو هیندییەكاندا، لە ئیسلامدا هیچ گەلێك لە گەلێكی دیكەو هیچ رەچەڵەكێك لە رەچەڵەكێكی دیكە جودانابێتەوە، تیایدا پشت نابەسرێت بە خوێن و ڕەگەز، بەڵكو پشت دەبەسرێت بە سووربوون لەسەر خودا لەخۆ ڕازیكردن و حەزكردن لە گەیشتن بە خوداو جوان وەرگرتنی ڕێنماییەكان و جێبەجێكردنیانو ئەندازەیەكی زۆری جیهاد و خۆماندووكردن و كۆششكردن (إجتهاد) و بەرزبوونەوە و پێشكەوتن تیایاندا.

ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بە سەنەدی خۆی لە پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (لو كان العلم بالثريا لتناوله أناس من أبناء فارس) [1] .

واتە: (ئەگەر زانست و زانیاری هێندە بەرز بێت و بگاتە كۆهەسارە (كۆمەڵە ئەستێرەیەكی ورد و بەرزن)، هێشتا هەر دەستی خەڵكانێك لە نەوەكانی فارسی [2] پێدەگات و وەدەستیدەهێنن).

---

[1] فەرموودەكە بەم لەفزە لاوازە، بەڵام بە صەحیحی لە (صحيح مسلم و مسند إمام أحمد)دا هاتووە، بەم لەفزەی خوارەوە: عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "لو كان الدين عند الثريا لذهب به رجل من فارس ـ أو قال ـ من أبناء فارس حتى يتناوله". (طاهر)

عەرەبەكانیش لە هەموو سەردەمانێكدا بچووكیی هەركەسێكیان كردووە، كە لە زانستە ئایینییەكاندا دەركەوتبێت و تیایدا بەرزبووبێتەوە و لەم زانستانەدا بە پێشەوا و گەورەیان دانیانناوە، زۆر وەسف و نازناویان لێناون، كە لە زۆرێك لە زانا عەرەبەكانیان نەناوە كە لەم زانستانەدا هەڵكەوتوون، نازناوی (ئەمیری ئیماندارانیان لە فەرموودەدا) داوەتە ئیمام محەممەدی كوڕی ئیسماعیل، كوڕی ئیبراهیم، كوڕی موغیرە، كوڕی بەردەزبە)ی جوعفی بوخاری كە خاوەنی كتێبی (الجامع الصحیح)ـە (ساڵی ٢٥٦ ك كۆچی دوایی كردووە) كە خەڵكی بوخارایە و عەرەب نییە.

دەربارەی كتێبەكەی وتوویانە: ڕاستترین كتێبە دوای قورئان. هەروەها نازناوی (إمام الحرمين) واتە: ئیمامی مەككە و مەدینەیان داوەتە ئیمام ئەبولمەعالی، عبدولمەلیكی جوەینی نەیسابووری (ساڵی ٤٦٨ ك وەفاتی كردووە)، نازناوی (حُجّة الإسلام) یشیان داوەتە ئیمام ئەبو حامید، محەممەد كوڕی محەممەدی غەزالی تووسی (٥٠٥ كۆچی وەفاتی كردووە).

ئەو كەسانەی هاوپەیمانی تیرە عەرەبەكان بوون، یان ئەوانەی كە كۆیلەی عەرەبەكان بوون و پاشان ئازادكرابوون (الموالي)یان پێدەوتن، هەروەها ئەو كەسانەی كە لە نەتەوەی عەرەب نەبوون، ئەوانە سەرگەورەی جیهان و مەرجەعی مسوڵمانان بوون لە هەموو پایتەختەكانی مەملەكەتی فراوانی ئیسلامی لە كۆتایی سەدەی یەكەمی كۆچیدا. سەرۆكایەتی زانست

---

(٢) واتە: پێغەمبەر (ﷺ) هەر باسی عەرەبی نەكردوە و بەرزبوونەوە و سوودمەندبوون لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامی تایبەت نەكردووە بە گەلێكەوە و گەلێكی دیكەی لێبێبەش بێت. (طاهر).

(رئاسة العلم) و فەتوا و شەرعزانی و زانستی فەرموودە کەوتە دەستیان، ئەمە سەرگوزەشتەیەکی زانراوە.

هەموو کتێبی توێژەکان (الطبقات) و ژییاننامەکان (السير والتراجم) و مێژووی شارستانییەتی ئیسلامی یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە باسمان کرد لە چاخە زێرینەکانی ئیسلامیدا کە عەرەب دەسەڵاتیان تێدا هەبوو.

هەتا هەڵکەوتەی عەرەب زانای زۆر شارەزا: عبدوڕڕەحمانی کوڕی خەلدون (ئیبن خەلدون)ی مەغریبی (ساڵی ٨٠٨ ك وەفاتی کردووە) دەڵێت: (لە شتە سەرسوڕهێنەرکان ئەوەیە هەڵگرانی زانست لە ئایینی ئیسلامدا زۆربەیان ناعەرەبن، چ لە زانستەکانی شەرعدا، یان لە زانستە عەقڵیەکاندا، تەنها کەمێکی دەگمەنیان نەبێت، ئەگەر عەرەبیشیان تێدا هەبێت بەڕەچەڵەك، ئەوا لە زمان و پەروەردە و مامۆستاکانیدا عەجەمیە (ناعەرەبە)، ئەمە لە کاتێکدا ئایینەکە بە زمانی عەرەبی دابەزیوە و خاوەنی شەریعەتەکەی (پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) عەرەبیە).

هەروەها دەڵێت: (خاوەنی پیشە (پسپۆڕی)ی نەحو (سیبەوەیهی) و لە دوای ئەو، ئەبو عەلی فارسی و لە دوای هەردووکیان (زەججاج)، هەموویان بەڕەچەڵەك عەجەمن، هەروەها هەڵگرانی فەموودە و زانایانی (أصول الفقه)و هەڵگرانی عیلمی کەلام و زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان (المفسرين)، هەر بەهەمان شێوەن) [(١)] .

(ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، کە پێشتر باسمان کردن) چەند وشەیەکی نەمر بوون بە سەر زمانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) هات لە حەجی ماڵئاواییدا، کاتێکیش پێغەمبەر هەستا بەم

---

[(١)] (مقدمة ابن خلدون، المطبعة البهية المصرية) لاپەڕە ٤٠١ بە کورتکراوەی.

ڕاگەیاندنە مێژووییە مەزنە، جیهان لە بارودۆخێکی سروشتی و هێدی و ئارامدا نەبوو، کە ئەم چەند وشە بوێر و ڕاشکاوانە تێپەڕێنێت و تەحەمولی بکات، ئەم ڕاگەیاندنە کەمتر نەبوو لە بوومەلەرزەیەکی بەهێزی توند، هەندێك شت هەیە تەحەمولی دەکەین بە شێوەیەکی پلەپلەیی (تدریجی)، یان لە پشت پەردەوە وەکو تەوژمی کارەبایی، دەکرێت دەستی لێبدەین لە کاتێکدا داپۆشراوە، یان لە ناو وایەرەکاندا، بەڵام ئەگەر بە ڕووتی دەستی لێبدەین ئەوا تووشی ڕاتەکانێکی توندمان دەکات، یان هەر بە یەکجاری لە ناومان دەبات.

ئەم قۆناغە دوورەو ماوەفراوانەی زانست و تێگەیشتن و فیکری ئینسانی، کە ئەمڕۆ مرۆڤایەتی بڕیویەتی، بە هۆی چاکە و فەزڵی بانگەوازی ئیسلامی و دەرکەوتنی کۆمەڵگەی ئیسلامیی و بە هەوڵ و کۆششی بانگخوازانو چاکخوازانو پەروەردەکارانەوەیە، وایکرد ئەم راگەیاندنە مەزنە شۆڕشگێڕانە، هەڵچوێنەرە (الفائر) و هەژێنەرەی هێلانەی جاهیلییەت و قەڵای شیرك و بتپەرستی و ڕەگەزپەرستی ببێتە راستییەکی ڕۆژانەی ئاسایی کە ئەمڕۆ هەموو دامەزراوەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتی لە جیهاندا بانگەوازی بۆ بکات، لەوانە پەیماننامەی مافەکانی مرۆڤ ( Human Rightes charter) کە نەتەوە یەکگرتووەکان ئاڵاکەی هەڵگرتووە، هەموو وڵاتێکی کۆماری لێدوانی لەسەر دەدات و هەموو دامەزراوەیەکی تری بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤـ و یەکسانی ئینسانی پشتیوانی لێدەکات و هیچ کەس بەلایەوە شتێکی نامۆ نییە.

## بارودۆخی کۆمەڵایەتی پێش ئیسلام و پیرۆزڕاگرتنی بنەماڵە و تاکەکان

ڕۆژگارێك بەسەر مرۆڤدا تێپەڕ بووە، کە عەقیدەی شەرافەتمەنتری هەندێك نەتەوە و بنەماڵە تێیدا بڵاوبووە و لە سەرووی ئاستی مرۆڤەوە تەماشا دەکران، تەنانەت هەندێك بنەماڵە و بنەچەکان ڕەچەڵەکی خۆیان دەدایە پاڵ خۆر و مانگ و پاڵ خودا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا) (الإسراء: ٤٣). واتە: (پاك و خاوێنی و بەرزی و بڵندی بۆ خودا لەوەی نەفامەکان دەیدەنە پاڵی لە شیرك و خێزان و کوڕ و نەوە).

قورئانی پیرۆز قسەی جوولەکە و دیانەکانی بۆ باس کردووین.. (وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ)(المائدة: ١٨). واتە: (جوولەکە و گاورەکان وتیان: ئێمە کوڕانی خودا و خۆشەویستانی ئەوین).

هەروەها فیرعەونەکانی میسر لافی ئەوەیان لێدەدا، کە ئەوان بەرجەستەبووی (تجسيد) خواوەندی خۆر (رەع)ن و دەرخەری ئەون، بەڵام لە هیندستان دوو بنەماڵەی ناسراو لە نێویاندا هەبوو، ناویان لێنرابوو (سورج بنسی) کە نەوەی خۆر، (جندر بنسی) کە نەوەی مانگ دەگەیەنێت.

لە ئێران: کیسراکان لافی ئەوەیان لێدەدا، کە خوێنی خودایی بەنا و دەمارەکانیاندا ڕێدەکات، خەڵکی وڵاتیش بەشێوەی پیرۆزڕاگرتن و بە خودا تەماشایان دەکردن، هەتا هەندێك لە نازناو و وەسفەکانی (کیسرا پەروێز) (٥٩٠ــ ٦٢٨ز) ئەوە بوو: (لە خواوەندەکاندا مرۆڤێکی نەمر و لەناونەچوو (غير فانی) هەیە و لە مرۆڤەکانیشدا خواوەندێك هەیە دووەمی نییە، وشە و گوفتاری بەرزە و شکۆمەند و بڵندە، لەگەڵ خۆردا هەڵدێ، بە تیشك و پرشنگەکەیەوە و شەوگاری تاریك بە ڕووناکیەکەی ڕۆشن دەکاتەوە)[1].

---

[1] إيران في عهد الساسانيين، لاپەڕە: ٦٠٤.

هەروەها حاڵی قەیسەرەکانی (ڕۆم)یش هەروا بوو، واتە بە خوداوەند دەزانران و هەرکامیان جڵەوی حوکمڕانی وڵاتی بگرتایەتە دەست دەبووە خوداوەند بەلایانەوە و نازناویان بریتی بوو لە (Augustus = ئۆگۆستوس) واتە ترسێنەری مەزن و شکۆمەند (المهيب الجليل) [٢].

چینیەکانیش ئیمپراتۆریان بە (کوڕی ئاسمان) دادەنا و باوەڕیان وابوو ئاسمان نێرە و زەوی مێیە و بەهۆی بە یەکگەیشتنیان ئەم گەردوونە دروست بووە، ئیمپراتۆر (خەتا)ی یەکەمیش نۆبەرەی ئەم دوو هاوسەرە بووە. [٣]

بە نیسبەت عەرەبەکانیشەوە، ئەوەی لەخۆیان نەبووایە بە عەجەمیان دادەنا و هۆزی قورەیش خۆی بە بەڕێزترین هۆزی عەرەبی دەزانی، پارێزگاری لە جوداکاری خۆی دەکرد لە وەرزی حەجدا، جا لەبەر ئەوە تێکەڵی و هاوبەشی خەڵکی نەدەکرد لە شوێنی ڕاوەستاون و جێگەی حەوانەوەیاندا و لەگەڵ حاجیانی دیکەدا نەدەچووە عەرەفات، بەڵکو لە حەرەمی بەیتدا دەمایەوە و لە موزدەلیفە ڕادەوەستا و دەیانگوت: (ئێمە کەسی خوداین (أهل الله) لە شارەکەیدا و نیشتەجێی ماڵەکەی ئەوین و دەیانگوت: ئێمە (حُمس) [١] ین).

---

[٢] بڕوانە العالم الروماني (The Roman World)، دانراوی Victor Chopart ل٤١٨.

[٣] بڕوانە (تأريخ الصين) نووسینی (کارکرن).

[١] بوخاری لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە.

لە کتێبی ((النهاية)) دا هاتووە کە (حُمس) کۆی ((الأحمَس))ە، ئەویش قورەیش و ئەوەی لەو بووە و کینانە و جودەیلەی قەیس دەگرێتەوە، پێیان گوتراوە حومس، چونکە لە دینەکەیاندا بە حەماس بوون، واتە: تەشەددودیان کردووە و بە توندی گرتوویانە، ((الحماسة = الشجاعة)) واتە: ئازایەتی، لە کاتێکدا لە ئیحرامی حەجدا بوونایە لە دەرگاوە

هيندستان جوودا بوو له هەموو دەوڵەتانی دراوسێ و جیهان، ئەویش بە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان توێژ و چینەکانی گەلدا و جیاکردنەوەی مرۆڤ لە مرۆڤێکی دیکە.

سیستمێکی زۆر ڕەق و بە زەبروزەنگ بوو، نەرمونیانی تێدا نەبوو، بە ئایین‌و عەقیدەی هیندۆسی پاڵپشتی دەکرا، کەوتبووە ژێر ڕکێفی بەرژەوەندیی ئارییە داگیرکەر و خۆسەپێنەکان و (براهمیە) قۆرغکارەکانی ئایین و قەداسەتەوە، لەسەر بنەمای ڕەگەزایەتی و رەچەڵەکایەتی (السلالية) و پیشە و سەنعەتەکان و بەمیراتگرتنیان ڕاوەستابوو.

هەموو ئەمانە بەهۆی پەیڕەوکردنی یاسایەکی مەدەنیی و سیاسیی و ئایینی بوو، ئەو یاسادانەرە هیندییانە دایاننابوو کە سیفەتێکی ئایینییان هەبوو، ئەم یاسایەش بووبوو بە یاسای گشتی کۆمەڵگا، یان دەستووری ژیان کە دانیشتوانی هیندی دابەش دەکرد بۆ چوار چین:

١- چینی کاهین و پیاوانی ئایینی، کە (براهمی)یەکان (البراهمه) بوون. (کە بە باوەڕی هیندۆسییەکان ئەمانە خودا (براهما) لە دەمی خۆی دروستی کردوون).

٢- پیاوانی جەنگ (جەنگاوەرەکان) و سەربازەکان، ئەمانەش پێیاندەوترا (شوهتەری، یان کوشتەری))، ئەمانەش ئەرکیان بەرگرییکردن بوو لە وڵات و چینی بەرهەمیەکان. (هیندۆسەکان باوەڕیان وابوو خودا

---

نەدەچوونە ماڵەوە، بەڵکو لە پشتەوە بە سەربانەکان و دیوارەکاندا دەکەوتن و دەهاتنە ژوورەوە. ((دانەر ئەمانەی نەقڵ کردووە)).

تێبینی: دواتر ئیسلام ئەم جیاوازیی و ئەحکامە تایبەتییانەی پێگۆڕین و یەکسانی کردن لەگەڵ باقی مسوڵمانانندا. (طاهر).

ئەمانەی لە باسکی خۆی دروست کردووە، بۆیە بە ڕەمزی هێز و قوەت دادەنران).

٣- پیاوانی جووتیار و بازرگان و سەنعەتکار، کە پێیان دەوترا (ویش، یان ویشا).

(ئەمانەش ئەرکیان ئەوە بوو کە خۆراك و پێداویستی بۆ دوو چینەکەی سەرووی خۆیان دابین بکەن، هەروەها خۆراك و پێداویستی و کەرەستەی جەنگی بۆ چینی دووەم). (بە بۆچوونی هیندۆسەکان ئەمانە خودا لە ڕانی خۆی دروستی کردوون)[1] .

٤- چینی خزمەتکاران کە پێیاندەگوترا (شۆدەر) ئەمانە نزمترین چین و توێژی کۆمەڵگا بوون، خالیقی بوونەوەر (بە باوەڕی هیندۆسەکان) ئەوانی لەپێیەکانی دروست کردووە، ئەمانە جگە لە خزمەتکردنی ئەو چینانە و حەوانەوەیان هیچی دیکەیان بۆ نییە.

ئەم یاسایە جێگە و پلەو پایەیەکی بە (براهمابییەکان) دا، کە کەس تیایدا هاوبەشییان ناکات، بەرهەمیی ـ بەگوێرەی ئەم یاسایە ـ کەسێکی بووراوە، هیچی لەسەر نییە ئەگەر بە تاوان و کردەوەکانی هەر سێ چینەکەی خوار خۆی لە ناوببات، دروست نییە باجی لێبسەنرێت و لە هیچ حاڵێکدا سزای کوشتنی بەسەردا نادرێت، بەڵام (شۆدەر) بۆیان نییە ببن بە خاوەنی سامان، یان گەنجینە و پارە لەماڵدا هەڵگرن، یان لەگەڵ براهماییەکدا

---

[1] ئەوەی ناو کەوانەکان خۆم زیادم کردووە و سوودم لە سەرچاوەی دیکە وەرگرتووە، بۆ زانیاری زیاتر سەیری ((أدیان الهند الکبری))ی، أحمد شلبی بکە لا٥٢ – ٥٩، و نامەی ماستەرەکەی بەندە (الطغیان أسبابه وعلاجه وآثاره علی النفس والمجتمع) لا١٦٠ –١٦٢ مبحث الطغیان الاجتماعي/ الطبقیة. (طاهر).

دابنیشن، یان دەستیان لێبدەن، یان فێری کتێبە پیرۆزەکان بن [٢] خاوەن پیشەکانی وەك: تەونکارەکان و ماسی فرۆشەکان، ئاژەڵ سەربڕەکان (الجزارون)، پەتڕێسەکان (الحبّالین)، گسکدەرەکان (الکناسین)، ئەوانەی هەڵدەسن بە پاککردنەوەی شارەکان، هەموو ئەمانە ڕێگەیان پێنادرێت ـ بەگوێرەی بڕیارەکانی (منوسمرتی) ـ لەناو شاردا نیشتەجێ بن، بەڵکو دەبێت لە دەرەوەی شاردا نیشتەجێ بن و دوای خۆرهەڵاتن بچنە ناو شارەکان بۆ ئەنجامدانی کار و پیشەکانیان، دەبێت پێش خۆرئاوابوون لە شار بچنەدەر.

جا بەهۆی ئەم یاسایەوە، ئەو خەڵکانە مافی بەهرەمەندبوون و سوودمەندبوونیان نەبوو لە خێر و بێرەکانی ژیان و لە جوانییەکانی بێبەش بوون، ژیانێکی دەشتەکییانەی نزم و بێبایەخیان بەسەردەبرد [٣].

---

[٢] بۆ شارەزایی زیاتر تەماشای (القانون المدني الاجتماعي الهندي)، کە ناونراوە بە (منوشاستر)، بابی (١، ٢، ٨، ٩،١٠، ١١) یان کتێبی (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمین) لە ژێر سەرباسی (نظام الطبقات الجائرة) لا٨٧ چاپی ٦٦، چاپی (دار إبن کثیر)ی یەکەم ١٩٩٩ز بکە.

[٣] تەماشای (منوسمتری) بکە، بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە ئیمتیازاتی چینەکانیش تەماشای

(.Manu and yajnaval kya jayswal, P.٨٥)

## ڕۆڵی ئیسلام لە چەسپاندنی بنەمای یەکسانیی مرۆڤایەتی و کاریگەرییە جیهانییەکەی

ئیسلام بنەمای یەکسانی مرۆڤایەتیی ڕاگەیاند، بە گوتەیەکی ڕاشکاو و روون، کە لە سەرووییەوە ڕاشکاوتر نییە و هیچ تەحەفوزێکی تێدا نییەو ڕێز و پایەداری تەنها بەستۆتەوە بە تەقواو فەزائیلە مەعنەوییەکانەوە: وەکو خوای پەروەردگار فەموویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) (الحجرات:١٣).

گەورە جوامێرانی خۆرئاوا و گەورە خۆرهەڵاتناسان و لێکۆڵەران دانیان ناوە بە مەزنی و گەورەیی ڕۆڵی ئیسلام لە جێگیرکردنی بنەمای یەکسانی ئینسانیی و پراکتیزەکردنی لە کۆمەڵگایەکدا کە لەسەر بنەمای ئەو (واتە: ئیسلام) ڕاوەستاوە و تێیدا کار بە ڕێنماییەکانی دەکرێت.

نووسەری بەناوبانگ (H.A.R.Gibb) لە کتێبی (تجاه الإسلام) (Whither Islam)دا دەڵێت: (هیچ کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی سەرکەوتنی بەدەستنەهێناوە وەك ئەوەی ئیسلام لە جێگیرکردنی یەکسانی لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا بەدەستیهێنا، ئەویش بە چاوپۆشی لە چینەکانی مرۆڤ و ڕەخساندنی دەرفەتی جۆراوجۆر و بواری کارکردن بۆیان.

لەدۆخی جالییەی گەورەی ئیسلامی لە ئەفریقیا و هیند و ئیندۆنیسیا و لە جالییەی بچووکی ئیسلامییش لە یابان، بەجوانی توانای ئیسلام لە تواندنەوەی جیاوازیی و ناکۆکییەکان لە نێوان گەل و نەتەوە

جۆراوجۆرەكان و لە نێوان ئەو دابونەریتانەی، كە بەدرێژایی سەدان ساڵ و بەدرێژایی مێژوو خۆیان سەپاندبوو، دەركەوت.

جا ئەگەر بمانەوێت لە جێگەی كێشمەكێش و رقەبەرێتی، سۆز و گیانی هاوكاری بخەینە نێوان هەردوو كۆمەڵگەی گەورەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا، ئەوا دەبێت لە وەدیهێنانی ئەم خواستەدا یارمەتی و كۆمەك لە ئیسلام وەربگرین و پشتی پێببەستین)[1].

هەروەها مێژوونووسی فەیلەسووف تۆینبی (A.J.Toyanbee) لە كتێبەكەی (شارستانی لە تاقیكردنەوەدا - الحضارة في الامتحان) (Civilization on Trial)دا دەڵێت: (لەناوبردنی جیاوازییە رەچەڵەكایەتییەكان (الفوارق السلالية)و دەمارگیرییە ڕەگەزی و خوێنییەكان لە گەورەترین شاكار و شانازییەكانی ئیسلامە، بە نیسبەت ئەم سەردەمەی ئێستاشمانەوە كە تێیدا دەژین ئەم فەزیلەتە لە گەورەترین پێداویستییەكانی ئەم سەردەمەیە، گومانی تێدا نییە ئەو گەلانەی بە زمانی ئینگلیزی دەدوێن هەندێك سەركەوتنییان وەدیهێناوە لە بەستنەوەی ئەم گەلانە بە یەكترەوە، ئەمەش بەسەر جیهانی مرۆڤایەتییەوە بەخێر و خۆشی و ڕەحمەت شكایەوە، بەڵام ئەو ڕاستییەی كە دەبێت دانی پێدا بنرێت ئەوەیە: ئەم گەلانە لە زاڵبوون بەسەر سۆزی رەچەڵەكایەتی و ڕەگەزییدا سەرنەكەوتن)[1]

هەروەها لۆرەنس (Lawrence –e – Browne) لە كتێبی ( The Prospects of Islam) دا دەڵێت: (ئەو برایەتییەی كە ئیسلام ڕایگەیاند،

---

[1] H.A.R. Gibb Whither Islam,London, ١٩٣٢-P.٣٧٩.
[1] A. J. Toyanbee, Civilization on Trial (Newyork, ١٩٨٤, P-٢٠٥).

کارێکی واقیعی و شتێکی ناوازە بوو، کە گەلانی خۆرهەڵات پێشتر پێی ئاشنا نەبوون، ئێمە گومانمان هەیە لەوەی، کە مەسیحییەکانی سوریا مامەڵەی برایانەیان لەگەڵ مەسیحییەکانی ئێراندا کردبێت، وەك ئەوەی مسوڵمانانی شام مامەڵە لەگەڵ برایانی ئایینیان دەکەن لە ئێرانییەکان و بە ئەندامانی یەك خێزانیان دادەنێن)[٢] .

ئەم باسە بە شایەتی خانمێکی هیندۆکی (هیندۆسی) کۆتایی دێنین، کە لە دیارترینی خانمانی نیمچەقارەی هیندییە و ئەدیب و شاعیرە لە زمانی ئینگلیزیداو ناوی (Sarojini Naidu)ە، ناوی بولبولی هیندی لێنرابوو، لەم دواییەدا حاکمی گەورەترین ویلایەتەکانی هیند بوو، کە ویلایەتی باکوور (Utter Pradesh) بوو، ئەم خانمە لە کتێبی (محاضرات ومقالات)دا دەڵێت: (ئایینی ئیسلام یەکەم ئاین بوو، کە بانگی بۆ دیموکراسیەت[٣] کردووەو کاری بە بنەماکانی کردووە، کاتێك دەنگی بانگ

---

(٢) Lawrence –e – Browne The Prospects of Islam. (london, ١٩٤٩) P. ١٢.

(٣) لێرەدا نووسەر مەبەستی یەکسانی و مامەڵەی دادپەروەرانەی نێوان مسولمانانە، بەڵام دەبێت ئاگاداربین کە وەسفکردنی ئیسلام بە دیموکراسی، یان سۆسیالیستی، یان ثیوکراتی، یان هەر زاراوەیەکی دیکەی خۆرئاوایی شتێکی هەڵەیە:

یەکەم: چونکە هەریەکە لەو زاراوانە پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ مێژوو و واقیعی خۆرئاوادا هەیە و لە زەینی کەسێکی خۆرئاواییدا لە کاتی بیستنی هەر یەکێك لەو زاراوانە، هەموو ئەو ڕووداو و شۆڕش و گۆڕانکارییانە حزوری هەیە و تێدەگات لە ڕابردوو و ئێستایان، بەڵام کەسێکی خۆرهەڵاتی تەنها ئێستای ئەم زاراوانە تێدەگات و ئەستەمە بتوانێت بە جوانی دەرکی ڕابردووی ئەم زاراوانە بکات، بۆیە وێناکردنی بۆیان وێناکردنێکی ناتەواو و تێکەڵ و پێکەڵە. دووەم: سەردەمانێك یەکێك لەم زاراوانە ڕەواجی دەبێت و خەڵکانێکی زۆر بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵام چونکە هەمووی زادەی بیروهۆشی مرۆڤە و پاش ماوەیەك سلبیاتەکانی دەردەکەوێت خەڵکیی لێی ڕادەکەن، وەك بەسەر سۆسیالیستیدا هات، دوای شۆڕشی (١٩١٧)ی ڕوسیاو هەتا نزیکی ڕووخانی حکومەتی شیوعی لەو وڵاتەدا، ئەو ماوەیە زۆر بە خەستو خۆڵی مارکسیەت لە برەودا بوو، خەڵکانێکیش لە وڵاتانی ئیسلامی

له مەنارەی مزگەوت بەرزدەبێتەوە، یەکسەر ئەوانەی کە دەیانەوێت خودا

---

بانگەشەیان بۆ دەکرد و ئیسلامیان تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە سەرمایەدارییە، لە بەرانبەریشدا هەندێك لە بیرمەندانی ئیسلامی دەهاتن بۆ بەرگرییکردن لە ئیسلام هەوڵیان دەدا بیسەلمێنن کە ئیسلام سۆسیالیستییە.

ئەمجا مەترسی ئەمە لەوەدایە کاتێك نەوەی مسوڵمانان پەروەردە بکرێن لەسەر ئەوەی کە ئیسلام ـ بۆ نموونە ـ سۆسیالیستییە و پاشان سۆسیالیزم هەرەسی هێنا و سلبیاتی خرایە ڕوو، ئەوکاتە ئەو نەوانەی لەسەر ئەوە پەروەردە کراون کە ئیسلام سۆسیالیستییە، دەکەونە گومان و دوودڵییەوە لە خودی ئیسلام، جا ئەمە بەنیسبەت سوسیالیستییەوە شتێکی ڕابردوو بوو، بە نیسبەت دیموکراسیشەوە هەروایە، چونکە دیموکراسیش سلبیاتی زۆری هەیە، کە ڕەنگە ڕۆژێك بێت مرۆڤایەتی لە دیموکراسیش بکەوێتە تەقە، یان لە هەندێك لە بنەماکانی، ئەگەر لە هەمووشی نەبێت.

سێیەم: ئەم زاراوانە ناتوانن وەفا بە حقیقەتی ئیسلام بکەن و بە دەربڕینیان بتوانین وێنایەکی تەواوی ئیسلام بکەین، بەڵکو ئەم زاراوانە کرچ و کاڵن و ئیسلام لە سەداسەد وەك هیچێك لەو بیروبۆچوونە مرۆڤکردانە نییە.

بەڵێ ڕەنگە هۆکاری بەهەڵەدا چوونی هەندێك کەس لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت، کە هەندێك خاڵی هاوبەش لە نێوان ئیسلام و هەندێك لەو ئایدۆلۆژییانەدا هەبێت، بەڵام بەبوونی ئەم خاڵە هاوبەشانە مانای ئەوە نییە کە یەکن، خۆ ئیسلام خاڵی هاوبەشی لە هەندێك ڕووەوە لەگەڵ ((یەهودیەت، یان نەصرانیەت) دا هەیە، بەڵام هیچ کات عاقڵێك ناڵێت با بە ئیسلام بووترێت یەهودیەت، یان نەصرانییەت.

چوارەم: شتێکی دیکە هەیە کە دەبێ بیڵێین، ئەویش ئەوەیە کە چونکە ئیسلام پەیامی خودایە بۆ مرۆڤایەتی هەتا کۆتایی دونیا، هیچ کەموکورتیەکی تێدا نییە تا بمانەوێ بە هەندێك وشەی زەرق و بەرق پڕی بکەینەوە، بەڵکو ئیسلام هەموو ئیجابیاتی دیموکراسی و ئایدیا مرۆڤکردەکانی بەزیادەوە تێدایە و (بەری)یە لە کەموركورتیەکانی، بۆیە هیچ پێویستی بەوە نییە بە دیموکراسی، یان سۆسیالیستی، یان هەر وەسفێکی دیکە وەسف بکرێت.

بۆ زیاتر بەر چاو روونی، بڕوانە کتێبی: (منهاج الإسلام في الحكم. محمد اسد = لیۆ پۆڵد ڤایس). ترجمة: منصور محمد ماضي(ط٣ دار العلم للملايين بيروت – لبنان ١٣٨٦هـ/١٩٦٧ م ): ٤٥ – ٥٢. و مجلة البيان، مقال: إشكال المصطلحات من المنظور الحضاري. د. أحمد محمد الدمشقي(السنة السادسة عشرة، العدد (١٦٦) جمادي الآخرة ١٤٢٢هـ / سبتمبر(أيلول) ٢٠٠١: ١٢٦. (طاهر)

بپەرستن کۆدەبنەوە، هەر هەموویان لەیەك ڕیزدا ڕۆژانە پێنج جار کۆدەبنەوە و لە بەرامبەر خودادا بە گوێرەی دەنگی (الله أكبر)ی ئیمام و دادەنەون (يركعون)، یەکسانی ئیسلامی لە جوانترین شێوەکانیدا دەردەکەوێت.

من جار دوای جار هەستم بەوە کردووە، کە ئیسلام بەهۆی هێزی یەکێتی کردارییەوە (الوحدة العملية) تاکە جیاوازەکانی نەوەی ئادەم لە یەك پەتی برایەتیدا (وەك تەسبیح) دەهۆنێتەوە، ئەگەر بە میسرییەك، یان جەزائیرییەك، یان هیندییەك، یان تورکییەك بگەی لە شاری لەندەندا، ئەوا لە دیدی هیچ کەسێکیاندا گرنگ نییە کە نیشمانی یەکێکیان میسرە و نیشتمانی ئەوی دیکەیان هیندە) [١] .

---

[١] Sarojini Naidu: Speeches & Writings Madras, ١٩١٨, P. ١٦٩ .

## له هیندستاندا

له سەرسووڕهێنەرترینی ئەو شتانەی مسوڵمانان لەگەڵ خۆیاندا هەڵیانگرتبوو کاتێك چوونە هیندەوە ـ کە لە توندترین وڵاتە لە دەستگرتن بە ڕەگەزایەتی (العنصریه)[٢] و سیستمی چینایەتی هەمیشەییەوە وەك پێشتر باسمانکرد ـ بریتی بوو لە یەکسانی مرۆڤایەتی کە هیند ئاشنایەتی لەگەڵیدا نەبوو، بەپێی ئەم بنەما ئیسلامییە، نە سیستمی چینایەتی بوونی هەیە، نە دەرکراو و پشتگوێخراو، نە پیسی زگماکی (النجس بالولادە) و نە نەزانێك فێربوونی لێ قەدەغە دەکرێت و نە بەشکردنی هەمیشەیی پیشە و سەنعەتەکان، بەڵکو مرۆڤەکان هەموو پێکەوە دەژین و هەموو دەخۆن و بە یەکسانی مافی فێربوونیان هەیە و بە ویستی خۆیان ئەو پیشە و سەنعەتانە هەڵدەبژێرن کە ئارەزووی دەکەن.

ئەوە شۆکێکی بەهێز بوو بەر زەینی تاکی هیندی و کۆمەڵگەی هیندی کەوت، بەڵام گومانی تێدا نییە کە سوودی زۆری بە هیند گەیاند و لە توندیو تۆکمەیی سیستمی باوی چینایەتی کەمکردەوەو پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ دروستبوونی پەرچەکردار (رد الفعل) لە دژی سیستمی چینایەتی و هاندەری بانگکارانی چاکسازیی کۆمەڵایەتی و هەڵوەشاندنەوەی نەریتی دوورکەوتنەوە لە چینی خوارەوەی کۆمەڵگە(اللمس المنبوذ) بوو. (کە بریتی بوو لەو یاسا کۆمەڵایەتیەی دەڵێت: نابێت جەستەی چینی

---

[٢] وام بە چاك زانی (العنصرية) بە ڕەگەزایەتی وەربگێڕم، نەك ڕەگەزپەرستی، وەك چۆن (القومية) تەرجەمە دەکەین بە نەتەوایەتی، چونکە دەمارگیری بۆ ڕەگەزێك، یان ڕەنگێك، یان نەتەوەیەك، هەرچەندە حەرامە و کارێکی دزێوە، بەڵام مەرج نییە ئەو کەسەی ئەم دەمارگیرییەی تێدایە، ئەو ڕەگەزە بپەرستێت، تا پێی بڵێین ڕەگەزپەرست.

خزمەتگوزار  بەر جەستەی چینەکانی تر بکەوێت (وەك ئاماژەیەك بۆ کەمنرخیی چینی خزمەتگوزار... وەرگێڕ)

دکتۆر (تارا جاند) لە کاتێکدا دەربارەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و گەل دەدوێت لە سەردەمی مەغۆلیدا، دەڵێت:

(لەم سەردەمەدا چەند قوتابخانەیەکی فیکری دامەزران، زمانی میللییان وەك ئامرازێك بۆ تێگەیاندن لە بانگەشەی بیرە شۆڕشگێرییەکان بەکاردەهێنا و بانگەوازەکەیان بە دەوری چینە نزمەکانی کۆمەڵگەدا دەخولایەوە و ئومێدو هیوا بوون بۆ جەماوەری بێبەش بۆ پێشکەوتن و وەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانیان، خاوەنی ئەم بانگەوازانە تەرکیزیان ئەکردە سەر کەرامەتی مرۆڤ و ڕێزی مرۆڤایەتی، چونکە باوەڕیان وابوو هەموو تاکێك دەتوانێت بگاتە بەرزترین ئاست کە بگونجێت مرۆڤ پێی بگات، ئەویش لە ڕێگەی کار و کردەوەی تاکەکەسی خۆیەوە، بۆیە چینی کاهینەکانیان ڕەتدەکردەوە (کە خۆیان بە ناوەندگیر (واسیتە) لە نێوان خەڵك و خوادا، یان خەڵك و پەرستراوە دروستکراوەکاندا دەزانی)[١].

هەروەها زیارەتی پەرستگا بتپەرستییەکان و نەریت و عادەتە باوەکانیان ڕەتدەکردەوە، بانگ و بانگەوازیان ئەوەبوو: مرۆڤ دەتوانێت خودا بناسێت و ڕاستەوخۆ بیپەرستێت.

ئەم بزاڤە لە سەدەی پازدەهەمی مەسیحییەوە دەستی پێکرد و هەتا ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم بەردەوام بوو، پاشان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا وردە وردە لاواز بوو، سەرکردەکانیشی بەسەر ناوچە جیاجیاکانی

---

[١] ئەم زیادەیە بۆ ڕوونکردنەوە خراوەتە نێو دەقەکەوە لەلایەن منەوە. (طاهر)

هيندا دابەش بوون، بەڵام كاريگەريی ئيسلامی بە ڕێنمايی و بیرو باوەڕەكانيانەوە ڕوون و ئاشكرا ديار بوو)[٢] .

جەواهیر لال نەهرۆ سەرۆك وەزيرانی پێشووی هيند دانی بەم ڕاستييەدا ناوە و دەڵێت: (هاتنە ناوەوەی شاڵاوبەران (الغزاة) لە باكووری خۆرئاوای هيندەوە لەگەڵ هاتنەناوەوەی ئيسلام گرنگييەكی زۆری لە مێژووی هينددا هەيە، پەردەی لەسەر خراپەكاری هەڵماڵی كە لە كۆمەڵگەی هيندۆكيدا پەرەی سەندبوو، دابەشبوونی چينەكان و (اللمس المنبوذ) و حەزی دوورەپەرێزيی لەجيهان و كەنارگيریی كە هيند تێيدا دەژيا، دەرخست.

بنەمای برايەتی و يەكسانی ئيسلامی، كە  مسوڵمانان باوەڕيان پێ هەبوو و تيايدا دەژيان، كارێكی قووڵی كردە سەر هزری هيندۆسەكان، ئەوانەش دەكەوتنە ژێر ئەم كاريگەرييەوە زياتر هەژار و نەدارەكان بوون، كە كۆمەڵگەی هيندی بێبەشيكردبوون لە يەكسانی و سوودمەندبوون لە مافەكانی مرۆڤ)[٣] .

---

[٢] Society and the Aste in the Mughal Period. Delhi ١٩٤١, P. ٩١.
[٣] Discovery of India , ٣٣٥ - ٥٢٦.

سێیەم چاکەی مەزنی ئیسلام بەسەر مرۆڤایەتییەوە، ڕاگەیاندنی ڕێز و بڵندیی مرۆڤ و شەرەف و پایەبەرزی مرۆڤایەتییە.

مرۆڤ پێش فروستادەیی موحممەد گەیشتبووە دامێنی زەبوونی و سووکی، لەسەر ڕووی زەوی هیچ شتێك لە مرۆڤ بچووکتر و بێنرختر نەبوو، تەنانەت هەندێك ئاژەڵ و دار و درەختی پیرۆز، کە کۆمەڵێك ئەفسانە و بیروباوەڕی تایبەتیان پێدا هەڵواسرابوو، لە مرۆڤ بەڕێزتر و بەعیززەتتر بوون لە لای ئەوانەی دەیانپەرستن و شایستەتر بوون بە پاراستن و پارێزگاری لێکردن لە مرۆڤ، ئەگەر چی ئەوە لەسەر حیسابی کوشتنی بێتاوانەکان و خوێنڕشتنیش بووبێت.

ئەو پەرستراوانە قوربانییان لە خوێن و گوشتی مرۆڤ پێشکەش دەکرا، بێ هەستکردن بە ئازاری ویژدان و سەرزەنشتی دڵ و دەروون، لە سەدەی بیستەمدا هەندێك لە نموونە و وێنە دزێوەکانیمان بینی لە وڵاتێکی پێشکەتووی وەکو هینددا.

سەروەرمان محەممەد (دروودی خوای لەسەر) ڕێزو شەرەفو پایەو نرخی بۆ مرۆڤایەتی گێڕایەوە و ڕایگەیاند: مرۆڤ بەڕێزترینو بەعیززەتترین دروستکراوە لەم بوونەوەرەدا و بەنرخترین گەوهەرە لەم جیهانەدا، هیچ شتێك نییە بەڕێزترو شایستەتر بێت بە خۆشەویستی و شایانتر بێت بە پارێزگاریی لێکردن، لەم مرۆڤە.

سەروەرمان مرۆڤی بەرزکردەوە هەتا مرۆڤ بوو بە جێنشینی خودا و هەموو جیهان بۆ ئەو دروستکراوە و خۆیشی تەنها خولقێنراوی خودایە: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الآرْضِ جَمِيعاً) (البقرة: ٢٩).

واتە: (ئەوە ئەو زاتەیە کە هەرچی وا لە زەویدایە هەمووی بۆ ئێوە خولقاندووە).

مرۆڤ بەرێزترین دروستکراوی خودایە و لە جێگەی سەرکردایەتی و پێشەوەدایە: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً) (الإسراء: ٧٠).

واتە: (بەڕاستی ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە و لە وشکانی و دەریادا هەڵمانگرتوون ــ واتە هۆکار و کەرەستە و ئامرازمان بۆیان ڕامکردووە، یان فێرمان کردوون خۆیان هەندێکیان ساز بکەن تا لە وشکانی و ئاودا هەڵیانبگرێت ــ و ڕۆزیشمان داون لە ڕۆزیە پاك و چاك و خۆشەکان و فەزڵێکی زۆری مرۆڤمان داوە بەسەر زۆرێك لەوانەی وەدیمانهێناون).

باشترین بەڵگە لەسەر ڕێزی مرۆڤ و دانانی بە گەورەیی ئەودا، فەرمایشتی سەروەرمانە کە دەفەرمووێت: ( الخلق عيال الله، فأحبُّ الخلق إلى الله مَن أحسن إلى عياله) [١] .

واتە: (خەڵك هەموویان بەخێوکراو و پەروەردەکراوی خودان، جا لەبەر ئەوە، خۆشەویستترینی خەڵك بەلای خوداوە، ئەوەیانە کە چاکە لەگەڵ بەخێوکراوەکانیدا بکەن).

هیچ دەستەواژەیەك بەهێز تر نییە لەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) کە خزمەتکردنی مرۆڤ و بەزەیی پێیدا هاتنەوەی بە پەرستش و نزیکبوونەوە بۆ لای خودا دادەنێت.

---

[١] رواه البيهقي. بەم لەفزە فەرموودەکە لاوازە، بەڵام ئەم فەرموودەیەی دیکە صەحیحەو هەمان مانای هەیە." خير الناس أنفعهم للناس"واتە: باشترینی خەڵکی بە سوودترینیانە بۆ خەڵك. بڕوانە: السلسلة الضعيفة٢٧٤/٤.(طاهر)

وەك ئەبو هورەیرە (خوای لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إن الله عز وجل يقول يوم القيامة: يا ابن آدم مرضت فلم تعدني! قال: يا رب كيف أعودك وأنت رب العالمين؟ قال: أما علمت أن عبدي فلانا مرض فلم تعده؟ أما علمت أنك لو عدته لوجدتني عنده ؟ يا ابن آدم استطعمتك فلم تطعمني! قال: يا رب وكيف أطعمك وأنت رب العالمين؟ قال: أما علمت أنه استطعمك عبدي فلان فلم تطعمه ؟ أما علمت أنك لو أطعمته لوجدت ذلك عندي ؟ يا ابن آدم استسقيتك فلم تسقني! قال: يا رب كيف أسقيك وأنت رب العالمين؟ قال: استسقاك عبدي فلان فلم تسقه أما أنك لو سقيته وجدت ذلك عندي) [٢] .

واتە: (خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم نەخۆشکەوتم کەچی سەرت لێنەدام: ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی پەروەردگارا، چۆن سەردانیت بکەم لە حاڵێکدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی (واتە: سەردانی تۆ مومکین نییە) دەفەرموێت: ئەی نەتدەزانی بەندەی من فڵان کەس نەخۆش کەوت و سەرت لێنەدا؟ ئەی نەتدەزانی ئەگەر سەرت لێبدایە بەڕاستی منت لە لای ئەو دەبینی [٣] ؟ ئەی نەوەی ئادەم، داوای

---

[٢] رواه مسلم في صحيحه . ٤/١٩٩٠ (٢٥٦٩)

[٣] لێرەدا بینینی چاو مەبەست نییە، چونکە خوای پەروەردگار لە دونیادا نابینرێت، ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکەوە ((دەستەواژەی: منت لەلای ئەو دەبینی))مان لە جیاتی دەستەواژەی (لوجدتني عنده) داناوە، کە کرداری (وجد) دەقاودەق وشەیەکی کوردیمان نییە لە بەرانبەریدا بەکاری بێنین، چونکە ئەم کردارە یەکێکە لەو کردارانەی کە پێیان دەوترێت (أفعال القلوب) کە ئەمانەش سێ بەشن، ئەم کردارە لە (أفعال اليقين)ە، کە دەڵێین لە (أفعال القلوب)ە واتە: بە دڵ بوونی منت لەوێدا دەزانی، چونکە خودای پەروەردگار ئاگای لێمانە و لە هەموو شوێندا هەیە بە عیلم و خەبیریەکەی، بەڵام بە زاتی لەسەرووی عەرشە و تێکەڵاوی مەخلوقاتی خۆی نەبووە، بەڵکو لێیان جودایە. (( طاهر )).

خواردنم لێکردی! کەچی خواردنت پێنەدام! ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار: چۆن خواردنت پێبدەم لە حاڵێکدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ (واتە: پێویستت بەخواردن نییە)، دەفەرموێت: ئەی نەتدەزانی کە بەندەی من، فلان کەس داوای خواردنی لێکردی، کەچی خواردنت پێنەدا؟ ئەی نەتدەزانی ئەگەر خواردنت پێبدایە ئەوا پاداشتەکەت لە لای من دەبینیەوە؟ ئەی نەوەی ئادەم! داوای خواردنەوەم لێکردی، کەچی خواردنەوەت پێنەدام، ئەویش دەڵێت: ئاخر چۆن خواردنەوەت پێبدەم لە حاڵێکدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ دەفەرموێت: ئەی فلان، بەندەی من داوای خواردنەوەی لێنەکردی، کەچی خواردنەوەت پێنەدا؟ ئەی نەتدەزانی ئەگەر خواردنەوەت پێبدایە، ئەوا پاداشتەکەیت لە لای من دەبینییەوە؟).

ئایا ڕاگەیاندنێکی ڕوونتر و ڕاشکاوانەتر لەم ڕاگەیاندنە وێنادەکرێت دەربارەی بڵندیی مرۆڤایەتی و بەرزی پایەی مرۆڤ، کە لە ئایینێکدا هاتووە دروشمەکەی یەکتاپەرستیە؟ ئایا مرۆڤ پلەوپایەی ئەوەندە بەرز و شەرەفی هێندە بڵندی لە هیچ دیانەت و فەلسەفەیەکدا بەدەستهێناوە لە جیهانی کۆن و نوێدا ؟.

سەروەرمان بەزەیی هاتنەوە بە نەوەی ئادەمی بە مەرجێکی پێویست داناوە بۆ وەدەستهێنانی بەزەیی و ڕەحمەتی خودا، ئەو، درود و سەلامی خوای لێبێت فەرموویەتی: (الراحمون يرحمهم الرحمن، إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء) [1] .

---

[1] رواه أبو داود والترمذي وهذا لفظه، وقال: هذا حديث حسن صحيح. سنن أبي داود ٢ / ٧٠٣ وسنن الترمذي ٤ / ٣٢٣ (طاهر).

واتە: ( ئەوانەی بەبەزەیین لە ئاست دروستکراوەکانی خوادا، خوداش ڕەحمیان پێدەکات و بەزەیی پێیاندا دێتەوە، بەزەییتان بێتەوە بەوانەی وا لە زەویدان، ئەوەی کە لە ئاسماندایە ـ واتە خوای پەروردگار ـ بەزەیی پێتاندا دێتەوە و ڕەحمتان پێدەکات)[٢] .

داخۆ بارودۆخی جیهان و حاڵەتی کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەی چۆن بووبێت پێش ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) ئەم بانگەوازە (بانگەوازی یەکێتی مرۆڤایەتی و کەرامەتی ئینسانیی) بەرپا بکات، پێش ئەوەی بەهێزترین جیهاد و تێکۆشانی لەپێناودا بکات؟.

نرخی شەهوەت و ئارەزووی تاقە کەسێك پێش پێغەمبەرایەتییەکەی سەروەرمان (دروودی خوای لەسەر) گەورەتر و بە بەهاتر بوو لە گیانی هەزاران‌و بگرە سەدەها هەزار مرۆڤ، یەك پادشا، یان یەك ئیمپراتۆر ڕادەپەڕی و وڵاتی ڕادەماڵی و خەڵکیشی دەکردە بەندە و کۆیلەی خۆی و کێڵگەو باخ‌و ڕەچەڵەك و وەچەی لەناو دەبردو، تەڕ و وشکی بەیەکەوە دەسووتاند، تەنها لەبەر ئەنانییەتی (منمنایەتی)یەکی پادشایەتی، یان تەماحێکی سیاسی.

ئەسکەندەری گەورەی مەقدۆنی (Alexander The Greet) (٣٥٦ ـ ٣٢٤ پ. ز ) هێرش دەکات و هەریەکە لە ئێران و سوریا و وڵاتانی

---

[٢] یاسایەکمان هەیە لە شەریعەتدا دەفەرموێت: الجزاء من جنس العمل، واتە: پاداشت و سزا لای خودا لە جۆری ئەو کردەوەیە کە خۆت دەیکەی، خودای بەرز و بالاش دەفەرموێت: (( هل جزاء الإحسان إلّا الإحسان))، لێرەدا (الاستفهام بمعنى النفي) پرسیارەکە بە مانای نەفی‌و نەرێیە، واتە پاداشتی چاکە جگە لە چاکە شتێکی دیکە نییە. جا هەر چاکەیەك و هەر جۆرێك و هەرچەندێك بێت. ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ (الزلزلة:٧،٨) (طاهر).

کەناراوەکان (البلاد الساحلیە) و میسر و زۆربەی تورکستان داگیردەکات، تا دەگاتە هیندی ژووروو، لە ڕێگەیدا چەندەها شارستانیەت و چەندەها مەدەنییەتی دێرین و پێشکەوتوو، تێکدەدات و تێکدەشکێنێت.

هەروەها یولیۆس قەیسەری ڕۆمی (٤٤ پ. ز مردووە)، (Julius Caesar) و شالاوبەرە داگیرکەرەکان و سەرکردە سەربازییەکانی وەك ئینیبالّی قەرتاجی (Hannibal) (٢٤٧ – ١٨٣ پ. ز ژیاوە) ڕادەپەڕن و کۆمەلانی خەلّك ڕاو دەکەن، هەرچۆن ڕاوچییەکی چاوچنۆکی چاوبرسی بێپەروا و بێباکانە ئاژەلان و گیانلەبەرانی دارستان ڕاو دەکات، ئۆپەراسیۆنی لەناوبردن و یارییکردن بە کەرامەتی مرۆڤ و ژیانییەوە هەتا دوای دەرکەوتنی مەسیح (سەلامی خوای لەسەر) هەر بەردەوام بوو.

یەکێك لە بکوژانی مرۆڤایەتی و ستەمکارە دلّڕەقەکان (نێرۆن)[1] (Neron) بوو (٦٨ ز مردووە)، کە کۆمەلّیکی زۆری لە هاونیشتمانییانی ژێردەستەی لەناوبرد، کە تیایاندا دایکی و خێزانی بوو، هەر ئەویش بە بەرپرسیار دادەنرێت لەو ئاگرە گەورەیەی کە لە ڕۆمادا کەوتەوە، لەکاتێکدا کە پایتەخت گڕی گرتبوو و دەسووتا، ئەو سەرقالّی گۆرانیو مۆسیقا بوو[2].

---

[1] ئیمپراتۆرێکی ڕۆمانیە لە سالّی (٣٧ – ٦٨ ز) ژیاوە، لە سالّی (٥٤ تا ٦٨) ئیمپراتۆر بووە، دایکی خۆی کە ناوی (ئەگریپینا) بووە و ژنەکەی (ئۆکتاڤیا) کوشتووە، مەسیحییەکانی دەچەوساندەوە و تۆمەتی سووتانی شاری ڕۆمای خستە پالّیان. بڕوانە: (المنجد في الأعلام) ل٥٨٣. (طاهر) .

[2] بۆ زانیاری زیاتر تەماشای (موسوعە تأریخ العالم، An encyclopedia of world History ی ویلیام لینگەر(William L.Langer بکە،١٩٩٤ز، چاپکراوە ).

هەروەها هۆزە ئەوروپیە دڕندەکانی قووت (قوگ)ی خۆرئاوای و خۆرهەڵاتییەکان و (وەندال) و غەیری ئەمانیش، لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا (سەدەیەك پێش هاتنی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر) بەخۆکەوتن و پایتەختە گەورە و ئاوەدانەکانیان تێکوپێکشکاند و بەسەر زەویدا خراپەیان بەرپا دەکرد، ترس و بیم و پێکدادان و ناجێگیرییان بڵاودەکردەوە (فعن البحر حدِّث ولا حرج) واتە: دەربارەی دەریا بدوێ و ئیحراج مەبە [١]. (مەبەست ئەوەیە نموونەگەلی زۆر هەن لەسەر ستەم و زۆری زۆرداران و دەسەڵاتداران).

عەرەبەکانیش جەنگیان بەلاوە سووك و ئاسان بوو، چەندە بەهای ژیانی مرۆڤ و ڕێزی ئەویان لەبەرچاو سووك بوو، بە ئەندازەی ئەوە خوێنیان ڕشت، هەتاوەکو ڕووداوێك هەرچەندە مەترسیداریش نەبووبێت بە ئاسانی دەبووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوانیاندا.

بۆ نموونە: جەنگ کەوتە نێوان خێڵی (بەکر و تەغلیب)، کە هەردوولایان نەوەی (وائیل) بوون، بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ بەردەوام بوو، خوێنی بەرپێژنەی تێدا ڕژێنرا، ئەمەش تەنها لەسەر ئەوە بوو (کولەیب)ی سەرۆکی تیرەی (مەعد) تێرێکی لە گوانی وشترەکەی (بسوسی کچی منقزدا و خوێنەکەی تێکەڵ بە شیرەکەی کرد، (جەسساسی کوڕی موڕرە)ش کولەیبی لە تۆڵەی حوشترەکەدا کووشتەوە، ئیتر شەڕ هەڵگیرسا و (بەکر و تەغلیب) تێکرژان.

وەکو موهەلهیلی برای کولەیب دەڵێ:

---

[١] تەماشای سەرچاوەی پێشوو بکە.

(هەردوو هۆزەکە تیاچوون، دایکەکان بێوەژن و منداڵەکان هەتیوکەوتن، فرمێسکەکان وشك نەدەبوونەوە و تەرمەکانیش نەدەنێژران)[٢] .

هەروەها جەنگی (داحیس و غەبراو) هۆکارەکەی تەنها ئەوەبوو، (داحیس) کە ئەسپی (قەیسی کوڕی زوهەیر) بوو، دواکەوتبوو لە کێبەڕکێیەکی نێوان (قەیسی کوڕی زوهەیر) و (حوزەیفەی کوڕی بەدر)دا، پیاوێکی ئەسەدی (واتە لە بەنی ئەسەد) بە فەرمانی (حوزەیفە) هاتە پێش ئەسپەکەی قەیس و دای بە دەموچاوی ئەسپەکەدا و سەرقاڵی کرد و کەوتەدوا، ئیتر پاش ئەمە کوشتن و تۆڵەسەندنەوە و سەرخستنی هۆزەکان بۆ ڕۆڵەکانیان و بەدیلگرتن و ئاوارەبوونی هۆزەکانی بە دواداهات، لە دەرئەنجامی ئەوەشدا هەزاران کەس کوژران[٣] .

غەزاکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، کە لە سەردەمی خۆیدا ئەنجامدراون و ژمارەیان گەیشتبووە ٢٧ ـ ٢٨ غەزا. هەروەها ژمارەی سرێکان[١] کە ڕەوانی کردبوون ژمارەیان گەیشتبووە ٦٠ سریێ، لە مێژووی جەنگ و شاڵاوبردنەکاندا کەمترین خوێنیان تێدا ڕژاوە، کوژراوانی هەموو ئەو جەنگانە لە (٩١٨) کوژراو لەهەر دوو لا تێپەڕی نەکردووە.

ئەم غەزایانە ڕێگربوون لە خوێنڕشتن و پارێزەربوون بۆ گیانی مرۆڤەکان و وەدیهێنەری ئامانجگەلێکی بەپێز بوون کە لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیدا بوون، ملکەچ بوون بۆ ئاکارە ئەخلاقییەکان و ڕێنماییە پڕبەزەییەکان، کە

---

[٢] بڕوانە (أيام العرب).

[٣] بڕوانە ( أيام العرب).

[١] غەزا لای زانایانی (سيرة) ئەو جەنگ و دەرچوونانەیە کە پێغەمبەر (ﷺ)خۆی تێیدا بووە، بەڵام سریێ (سرية) خۆی لەگەڵیدا دەرنەچووە، بەڵکو تەنها سەربازی ناردووە. (طاهر)

وایان لەم جەنگانە کردبوو کە زیاتر بە کردارێکی ئەدەب دادان (عملية تأديبية) بچن، نەك بە کرداری غەزا و جەنگ.

ئیسلام وزە لە باوەڕەوە وەردەگرێت، کە گرنگترین ڕینماییە ڕەوشتییەکانی هەستکردن بە ڕێزو بەرزییە ئە م هەستە لە مرۆڤدا بەهێز دەکات. تاوەکو مسوڵمان لەو بوارەدا هەستێکی ناسکی لا دروست بێت و لە هیچ حاڵێکدا ڕازی نەبێت لە پایەی ئاژەڵاندا دایبنێت و دڵی نەحەوێتەوە مامەڵە لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا بکات وەك هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ بێزمان و بێگیاندا، یەخسیریان نەکات بۆ بەرزبوونەوەی شەخسی و زاڵبوون بەسەریانداو هیچ جیاوازییەك لە نێوان خۆی و هاوڕەگەزەکانیدا نەبینێت، تاکو ملکەچو زەبوونیان بکات.

لە مێژووی ئیسلامیدا چیرۆکێکی ناوازە و خۆش هەیە لە یەکسانی و ڕێزگرتنی مرۆڤـ کە جێگەی خۆیەتی لێرەدا باسی بکەین:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: لە لای عومەری کوڕی خەتتاب بووین (ڕەزای خوای لێبێت) لەناکاو پیاوێك لە خەڵکی میسر هاتە لایو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، هانام بۆ هێناوی (هاتووم پەنام بدەی)! وتی: چیت لێ قەوماوە؟ وتی: (عەمری کوڕی عاص) غارغارێنی بە ئەسپەکان کردووە، ئەسپەکەی من کەوتە پێش هەموو ئەسپەکان، کاتێك خەڵك ئەوەیان بینی (محەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عاص) هەڵسا و وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوە ئەسپەکەی منە، کاتێك لێم نزیکبووەوە ئەسپەکەی خۆمم ناسیەوەو وتم: ئەسپی منە سوێند بە پەروەردگاری کەعبە! ئیتر بۆم هەستایەوە و بەقامچی کەوتە لێدانم و دەیگوت: بیگرە و من کوڕی هەرە بەڕێزەکانم! ئەنەس وتی: سوێند بەخوا عومەر لەوە زیاتری

پێنەوت، کە وتی: دانیشە، پاشان نامەی بۆ عەمر نووسی: (ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێگەیشت، یەکسەر وەرە و با محەممەدی کوڕیشت لەگەڵدا بێت)، وتی: عەمر کوڕەکەی بانگ کرد و پێیوت: شتێکت قەوماندووە؟ یان کەتنێکت کردووە؟ وتی نا! وتی: دەی عومەر بۆچی نامەت بەشوێندا دەنێرێت؟ وتی: دەی با بچین بۆ لای عومەر، ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: بەخودا من لەلای عومەر بووم، لەناکا و عەمرمان لێدەرکەوت، بە پەشتەماڵێكو پۆشاکێکەوە کە سەرووی لاشەی داپۆشی بوو، بەرەو لامان هات، عومەر چاوی دەگێڕا داخۆ کوڕەکەی دەبینێ؟ تەماشای کرد وا لەپشت باوکیەوەیە. وتی: کوا میسرییەکە؟ وتی ئەوەتام لێرە، وتی: ئەوەتە قامچیەکە، لە کوڕی هەرە بەڕێزەکان بدە! وتی: کەوتە لێدانی هەتا خوێناویی کرد، وتی: بیماڵە بە کەچەڵیەکەی سەری عەمریشدا، سوێند بەخوا لێی نەداوی لەبەر پشتئەستووربوون بە دەسەڵاتی باوکی نەبێت!.

**وتی: ئەمیری ئیمانداران، لەو کەسەمدا کە لێی دابووم! وتی: بەخودا ئەگەر لەویشت بدایە نەدەکەوتینە نێوانتانەوە هەتا تۆ خۆت وازت لێنەهێنایە! ئەی عەمر: ئەوە لەکەیەوە خەڵکیتان کردووە بە کۆیلە لە حاڵێکدا دایکانیان بە ئازادی هێناونی!.**

پاشان ئاوڕی دایە لای میسرییەکەوە و وتی: بڕۆ، جا ئەگەر گرفتێکت هاتە ڕێ نامەم بۆ بنووسە [1].

---

[1] سيرة عمر بن الخطاب، إبن الجوزي، ل ٨٦ – ٨٧.

# چوارەم

# گێڕانەوەی ڕێز بۆ ئافرەت و
# پێدانی ماف و بەشەکانی

له سەرەتاوە ئەو باکگراوندانە پێش دەخەین، کە پێویستە ئاگامان لێیان هەبێت بۆ هەستکردن بە گەورەیی ئەو ڕۆڵەی کە ئیسلام لە هاوردنەدی بەرژەوەندییەکانی ئافرەتدا، گێڕاویەتی.

ئەمەش چەند بڕگەیەکە لە کتێبی (المرأة في القرآن)ی مامۆستا (عباس محمود العقاد)، کە بە بەدواداچوون و بەدواداگەڕان و لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی ئەم بابەتە دادەنرێت.

دانەر لە باسی پایەی ئافرەت لە دیانەتەکان و کۆمەڵگا کۆنەکانی پێش ئیسلامدا دەڵێت:

(شەریعەتی (مانو)[1] لە هینددا هیچ مافێکی سەربەخۆی بە ئافرەت ڕەوا نەدەدیت کە جیابێت لە مافی باوکی، یان مێردەکەی، یان کوڕەکەی، لە حاڵی مردنی باوکو مێردەکەیدا، جا ئەگەر ئەمانە هەموویان نەمان، ئەوا

---

[1] ئەو (مانو)ە ی کە مامۆستا عەققاد ئاماژەی پێکردووە بریتییە لە (منو) کە لە نێو هیندییەکاندا بە سەرچاوەی یاسای کۆمەڵایەتی، مەدەنی، خێزانیی دادەنرێت، کەسێتییەکە بە زۆرێك لە تەمومژ (الغموض) و خەیاڵ و پیرۆزکردن دەورە دراوە و ناتوانرێت ئەو سەردەمەی تێیدا ژیاوە، یان کەسێتییەکەی دیاری بکرێت.

ئەو لە هەندێك لە دەستەواژەکانی کتێبە پیرۆزەکان ـ بە لای هیندییەکانەوە ـ بە (ویدا) دێتە بەرچاو کە خواوەندێکە لە سەرووی ئاستی مرۆڤەوە، لە هەندێك دەستەواژەی دیکەدا وا دەردەکەوێت کە باوکە گەورەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بێت و یەکەم داهێنەری بوونەوەر بنوێنێت، ئەم ناو و سیفەتانە لە هیندی کۆندا بەسەر چەندەها کەسایەتییدا دەبرێت، بەڵام (منو سمرتی) کە بریتییە لە دەستووری کۆمەڵایەتی و خێزانی هیندی کۆن، وەپاڵ (بهرکو مهاراج) دەدرێت، کە یەکێکە لە گەورە زانایانی یاسا لە هیندی کۆندا، ئەمیش لە زانستو تەشریعەکەیدا ئینتیمای بۆ (منو) هەیە.

(منو سمرتی) بە کۆنترین کتێبی یاسای هیندی کۆن دادەنرێت، زۆربەی توێژەران بۆ ئەوە دەچن کە ئەم کتێبە لە سەدەی سێیەمی پێش زایین دانرابێت.

(بۆ ئەم ڕونکردنەوەیە سوود لە دوو کتێبی دکتۆر (کنکاناتهە جها) و دکتۆر (جیسوال) کە لە گەورە زانایانی مێژووی یاسای هیندۆسین، وەرگیراوە). (نەدوی)

پێویستبوو بچێتە پاڵ یەکێك لە خزمانی مێردەکەی لە نەسەبدا، لە هیچ حاڵێکیشدا لە کاروباری خۆیدا، سەربەخۆ نەبوو.

لە پێشێلکرانی مافی هەڵسوکەوتی ژیان و مەعیشەتی دژوارتر، پێشێلکرانی مافی ژیانی سەربەخۆ و جودا بوو لە ژیانی مێردەکەی، چونکە ئەو ڕۆژەی کە مێردەکەی دەمرد بڕیاری بەسەردا دەدرا کە دەبێت ئەویش بەسەر ئاگرگایەکەوە (شوێنی سووتاندنی تەرم) لەگەڵیدا بسووتێنرێت و بمرێت.

ئەم خووە دێرینە لە کۆنترین چاخەکانی شارستانییەتی بەرهەمییەکانەوە هەتا سەدەی حەڤدەهەم بەردەوام بووە، دواتر سەرەڕای پێناخۆشبوونی خاوەن دروشمە ئاینییەکان، پووچەڵ بووەوە.

شەریعەتی حەموڕابی[٢] کەشاری بابل ناوبانگی پێدەرکردووە، ئافرەتی لە ڕیزی ئاژەڵانی خاوەنداردا دەژمارد، ئەوەش کە دەریدەخات تا چەند ئەم یاسایە ڕێزو پایەی بۆ ئافرەت داناوە ئەوەیە کە ئەم شەریعەتە فەرزی دەکرد لەسەر هەر پیاوێك ئەگەر کچی پیاوێکی دیکە بکوژێت، دەبێت (لە جیاتی خۆی) کچەکەی بداتە دەستی باوکی کچە کوژراوەکە تا لە تۆڵەی کچەکەیدا بیکوژێتەوە، یان ببێتە خاوەن کچەکە (واتە بیکاتە کۆیلەی خۆی) ئەگەر ویستی وابوو لێی خۆش بێت، ڕەنگە هەندێکجار ناچار بووبێت بیکوژێت تاکو دەقی فەرمانی شەریعەتەکە جێبەجێ بکات.

ئافرەت لەلای یونانییە دێرینەکان ئازادیی و پلەو پایەی لە هەموو ئەو شتانەدا کە پەیوەندی بە مافە ڕەواکانەوە هەیە، لێزەوتکرابوو، لە ماڵە

---

[٢] بەناوبانگترین پادشای بنەماڵەی حوکمڕانی عێراق بووە، کە حکومەتێکی بەهێزیان دامەزراندبوو و پێش سێ هەزار ساڵ لە هاتنی مەسیح حوکمیان کردووە. ( نەدوی)

گەورەکان (خانەدانەکان)دا لە جێگەیەکدا نیشتەجێ بوو جیا بێت لە ڕێگەی هاتوچۆوە و پەنجەرەکانی کەم بن و دەرگاکانی پاسەوانیی لێبکرێت.

لە شوێنە ئاوەدانەکانی یۆناندا یانەی ژنە بەشووەکان سەریهەڵدا و شۆڕەتی پەیداکرد، ئەویش لەبەر پشتگوێخرانی هاوسەران و ژنانیماڵەوە لەلایەن مێردەکانیانەوە و بە دەگمەن ڕێگەدانیان بە هاوڕێیەتیکردنی پیاوان لە یانەو کۆبوونەوە لە شوێنە راقییەکاندا.

مەجلیسی فەیلەسووفەکان خاڵی بوو لە ئافرەتان و تیایاندا ئافرەتێکی ناودار هەڵنەکەوت و ناوبانگی دەرنەکرد، ئەمە لە حاڵێکدا چەندەها ئافرەتی بەشوو (ئافرەتی ماڵەوە) و کەنیزەکە ڕەهاکراوەکان ناو و ناوبانگیان هەبوو.

(ئەرستۆ)[1] عەیبی لە خەڵکی (سپارتا = إسبرطة) دەگرت لەوەی کە نەرمونیانن لەگەڵ ژنانی هۆزەکەیاندا و مافەکانی میرات و تەڵاقی یەکجاری و مافەکانی ئازادی و دەرکەوتنیان پێدەدەن کە لە قەدر و ئەندازەی خۆیان زیاترە و هۆکاری کەوتن و لەناوچوونی (سپارتا)شی دەگێڕایەوە بۆ ئەو ئازادیو زیادەڕۆییەی لە مافەکاندا دەکرا!.

مەزهەبی ڕۆمانیە کۆنەکانیش هەروەك مەزهەبی هیندییە کۆنەکان وایە لە حوکمدان بەسەر ئافرەتدا بە ناتەواوی و کەموکوڕی، چونکە پێیانوابوو کە ئافرەت پەیوەستە بە باوکی، یان مێردەکەی، یان کوڕەکەی (واتە مافی سەربەخۆیی نەبوو)، ئەو دروشمەی کە لەکاتی شارستانییەتەکەیاندا

---

[1] ئەرستۆ: فەیلەسوف و بیرمەندێکی گەورەی یۆنانیە، لە نێوان ساڵی (٣٨٤ – ٣٢٢ پ. ن) ژیاوە، مامۆستای ئەسکەندەری مەکدۆنی بووە. لە کتێبەکانی: (سیاسەت)، (وتاربێژی)، (میتافیزیقا). بڕوانە: المنجد في الأعلام، ل٣٧. (طاهر)

دەستبەدەست لەیەکیان وەرگرتبوو، ئەوە بوو: ئافرەت ئەو کۆتەی لە دەستیدایە داناکەنرێت و ئەو نیرەی لەسەر ملیەتی دانامالرێت!.

لەوانەش گوتە بەناوبانگەکەی (کاتو): ( Nunguam Exuitur (Servitus Mulie Brio[1].

ئافرەتی ڕۆمانی لەم کۆتانە ڕزگاری نەبوو، هەتا کۆیلەکان لە پاش چەند شۆڕشێکی یەك لەدوای یەك و هەلگەڕانەوە و یاخیبوونی یەك لە دوای یەك لێیان ڕزگار بوون، لەدوای ئەوە بەکۆیلەکردنی ئافرەت مومکین نەبوو، هەر چۆن بەکۆیلەکردنی کەنیزەك و غولامەکان مومکین نەبوو.

ئەمجا مامۆستا عەققاد دوای ئەوەی دەربارەی شارستانییەتی میسری دوا، کە ئافرەت تێیدا بەهرەمەند بوو بوو لە هەندێك لە ماف و ئیعتیباراتەکانی، وتی: (بەلام شارستانییەتی میسری لەناوچوو، پێش سەردەمی ئیسلامی و یاسا و ڕێساکانیشی لەگەل خۆیدا لەناوچوون و بە خۆرهەلاتی ناوەڕاستی ئەو ڕۆژگارەدا و لە پاش ڕووخانی دەولەتی ڕۆمانی نەهامەتییەك بلاوەی کرد و پەرەیسەند، کە بریتی بوو لە ڕقلێبوونەوەی ژیانی دونیا، ئەویش بەهۆی نقومبوونی ئەم دەولەتەوە بوو لە ڕابواردن و خراپەکاریی و گەندەلییدا و هەلپەکردن بۆ وەدەستهێنانی هەرچی زیاتری چێژو ئارەزووەکان.

لە دەرئەنجامی ئەمەوە پەرچەکردار ڕایکێشان و بردنی بۆ ڕقلێبوونی مانەوە و ڕقلێبوون لە وەچەخستنەوە، لەم ماوەیەدا عەقیدەی بێبایەخی

---

[1] ئەم دەقە وەرنەگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و زمانی ئینگلیزیش نییە، نەمزانی داخۆ بە چ زمانێکە، بۆیە نەمتوانی وەریگێڕم، تکایە هەر بەڕێزێك دەتوانێ وەریگێڕێت ئاگادارم بکاتەوە تا بتوانین بە پشتیوانی خوا لە چاپەکانی دیکەدا بینووسین. (طاهر)

دونیاو باوەڕی پیسی لاشە و جەستە و پیسی ئافرەت تەشەنەی کرد و ئافرەت بەر نەفرەتی تاوانکاری کەوت (واتە: وەك تاوانکارێك تەماشا دەکرا)، لەبەر ئەوە خۆدوورگرتن لێی چاکەیەکی هەڵبژاردە بوو بۆ کەسێك کە ناچاری و زەروورەت بەسەریدا زاڵ نەبووبێت (واتە: لە حاڵەتی ناچارییدا نەبێت چاك وابوو بەلایانەوە توخنی ئافرەت نەکەون).

بەشێك لە پاشماوەی ئەم نەهامەتییە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوەبوو ئافرەت هەندێك لە لاهوتییەکانی (لێرەدا پیاوانی ئایینی مەسیحی مەبەستە)[٢] تا سەدەی پێنجەمی زایینی سەرقاڵ کردبوو، بۆیە چەند لێکۆڵینەوەیەکی جددیان لەسەر سروشت و خەڵقی ئافرەت ئەنجامدا لە مەجمەعی _کۆنگرەی (ماکون)دا پرسیاریان لە خۆدەکرد: داخۆ ئافرەت تەنها جەستە و لاشەیە؟ یاخود بریتییە لەلاشەیەك کە رۆحێکی تێدایە دەربازبوون و تیاچوونی پێوەبەندە؟ (واتە: بەهۆی ئەو رۆحەوە کە تیایدایە، بەرپرسیارێتی کردەوەکانی دەکەوێتە ئەستۆی، ئەگەر چاکە بکات پاداشتی چاکەکانی وەردەگرێت و ئەگەر خراپە بکات سزاکەی دەچێژێت)، بەڵام ڕایان هاتە سەر ئەوە کە ئافرەت خاڵییە لەو ڕۆحەی کە دەربازی دەکات و هیچ هەڵاوێردن (استثناء)ێك بۆ کچانی (حەوا) نییە لەم بڕیارەدا جگە لە خاتوو مەریەمی دایکی مەسیح (ڕەزای خوای لەسەر بێت)[١].

ئەم نەهامەتییە لە چاخی ڕۆمانیدا، هەموو ئەو شتانەی شاردەوە کە لە شارستانییەتی پێشووی میسرەوە بەجێمابوو دەربارەی پایەی ئافرەت.

---

[٢] دەستەواژەی نا و کەوانەکان بۆ ڕوونکردنەوە زیادم کردووە. (طاهر)

[١] چاکتر وابوو بگوترایە (سەلامی خوایان لەسەر بێت) بۆ ئەوەی هەردووکیان بگرێتەوە. (طاهر)

بەهێزبوون و توندبوونی ستەمی ڕۆمانییەکان بەسەر میسرییەکانەوە هۆکارێك بوو بۆ ڕووکردنە ڕەهبانیەت و پشتگوێخستنی ژیان، تائێستاش زۆرێك لە عابیدەکان پێیانوایە ڕەهبانیەت نزیکبوونەوەیە لە خودا و دوورکەوتنەوەیە لە داوەکانی شەیتان، کە یەکەمینیان ئافرەتە!.

ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسانی خۆرئاوایی دەڵێن: ئیسلام شەریعەتەکەی لەو شەریعەتانەوە وەرگرتووە کە پێشیکەوتوون، بەتایبەت شەریعەتی موسایی، بەڵام بە هیچ شتێك پووچەڵی و بێبنەمایی ئەم دەعوایە ڕوون نابێتەوە، وەك لەوەدا ڕوون دەبێتەوە کە بەراوردێك بکەین لە نێوان جێگە و پێگەی ئافرەت لە مافە شەرعییەکانیدا، وەك لە دەقەکانی تەوراتدا بۆی دیارییکراوە، لەگەڵ جێگەو پێگەی ئافرەت لە مافە شەرعییەکانیدا کە ئیسلام بە ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆز بڕیاری لەسەر داوە.

لەو کتێبانەی[٢] کە دراونەتە پاڵ موسا (سەلامی خوای لەسەر)دا هاتووە:

کچ لە میراتی باوکی دەردەچێت (واتە بێ بەش دەکرێت) ئەگەر باوکەکە نێرینەیەکی لە دوا بەجێمابێت، بێجگە لەو حوکمە ڕاشکاوە، ئافرەت هیچی دیکەی بۆ نییە، مەگەر ئەوەی باوکی لە ژیانی خۆیدا وەك دیاری و بەخشش هەڵیبژێرێت و بیداتە کچەکەی، چونکە وەك مافێکی شەرعیی دوای مردن، هیچ بەشە میراتێکی بۆ واجب نابێت!.

---

[٢] ئەو کتێبانەی دراونەتە پاڵ موسا (سەلامی خوای لەسەر) پێنج کتێبە و تەورات پێکدەهێنن، لە ناو تێکڕای کتێبەکانی (العهد القديم) دا، زۆر شتی ناقۆڵاو ناڕێکی تێئاخنراوە کە هەموو عاقڵێك دەزانێت ئەوە وەحی خودا نییە، هەر بۆیە لەسەرەوە دەڵێت: ئەو کتێبانە ـ بەکۆ ـ، پاشان دەڵێت: دراونەتە پاڵ موسا. (طاهر).

ئەو حوکمەی کە دەقی لەسەر هاتووە لە مافی میراتدا ئەوەیە: کچان بێبەش دەکات مادام باوکەکە وەجاخی کوێر نەبێت لە وەچەی نێرینە، ئەو کچەیش کە میرات دەبات (لە حاڵێکدا کە باوکی هیچ وەچەیەکی نێرینەی نەبێت) دروست نییە شوو بکاتە پیاوێك کە لە بەرەبابێکی[1] (تیرەیەکی) دیکە بێت و حەقی ئەوەی نییە کە میراتەکەی بگوازێتەوە بۆ کەسێك کە لە بەرەبابەکەی خۆی نەبێت، ئەم حوکمەش بە دەقی ئاشکرا و بێپێچ و پەنا ـ لە جێگەیەك زیاتر ـ لە کتێبەکانی تەوراتدا هاتووە.

ئێستاش دەچینە ئەو دەڤەرانەی کە دەعوە و بانگەوازی قورئانی پیرۆز لەوێوە دەستی پێکرد، ئەویش وڵاتانی دوورگەی عەرەبییە، پێشبینی ناکرێت ئافرەت تیایاندا بەشی هەبووبێت لە ویژدان و کەرامەت، جگە لەو بەشە گشتییەی کە لە وڵاتانی جیهاندا هەیبوو بە هەموو شوێنە دوورەکانی و عادەت و یاساکانیەوە، لەوانەشە ئافرەت هەندێکجار و لە هەندێك ناوچەکانی جەزیرەداو ئەوەندە حاڵی خراپ بووبێت دابەزیبێت بۆ دامێن، دابەزینێك کە لە هەموو لایەکی ئەم جیهانە و لای سەراپا نەتەوە و گەلان بەو شێوەیە دانەبەزیبێت!.

هەندێکجاریش بەرز دەبووەوە، بەڵام نەدەگەیشتە ئەوپەڕی بەرزی، لای مێردەکەی ڕێزی لیدەگیرا، چونکە کچی ئەو سەرۆکە بەهەیبەتە، یان دایکی ئەم کوڕە خۆشەویستە بووە، ئەمما ڕێزی لێگیرابێت و پارێزگاری لێکرابێت لەبەر ئەوەی لە ڕەگەزی ئافرەتانە، وەك سەرجەم هاوڕەگەزەکانی مافو

---

[1] دیارە یەعقوب (علیە السلام) کە (ئیسرائیل)یشی پێدەوترێت، دوازدە کوڕی هەبوو، لە هەر یەکەشیانەوە وەچەی زۆر کەوتۆتەوە، بە وەچەی هەریەکەشیان دەوترێت (سبط) واتە: بەرەباب، یان تیرە، کۆیەکەی (أسباط)ە و دوازدە تیرەکەی بەنی ئیسرائیل پێکدەهێنن، تەوراتیش بۆ بەنی ئیسرائیل دابەزیووە و ئەو حوکمەی سەرەوە باسی ئەوان دەکات. (طاهر)

هەڵسوکەوتی باشی پێڕەوا بینرابێت، ئەوە پلەو پایەیەکە لە ئینساف و کەرامەت کە هەرگیز ئافرەت پێی نەگەیشتبوو! لەوانەشە باوکی، یان مێردەکەی پارێزگاری لێکردبێت هەر چۆن براو کوڕ پارێزگارییان لێکردووە، پارێزگارییەکی فەرز و واجب، هەرچۆن لەسەری پێویست بوو پارێزگاری لە هەموو ئەو شتانە بکات کە لەپەنای ئەودا، یان لە ژێردەستی ئەودان، چونکە عەیب لە هەر پیاوێك دەگیرا ئەگەر سووکایەتی بە حەرەمەکەی کرابێت، هەر چۆن عەیبی لێدەگیرا ئەگەر دەستدرێژی بکرایەتە سەر هەر پاوان‌و قەدەغەکراوێکی، لەوانەش: ئەسپەکەی، وڵاغەکەی، بیرەکەی و لەوەڕگاکەی!.

لای هەندێکیش، ئافرەت ئەوەندە سووك بوو، وەك ڕیسواییەك وابوو کە کەسوکارەکەی ڕایان دەکرد لێی، یان وەکو کەلوپەل لەگەڵ ماڵ و ماڵاتدا بە میرات دەبرا.

جا لەترسی ئەو عەیب و سەرشۆڕییە، باوك هەر لە منداڵیدا کچەکەی زیندەبەچاڵ دەکرد، ئەو خەرجی و نەفەقەیەی بۆ کچەکەی دەیکرد بەزۆری دەزانی، بۆ کەنیزەکەکەی و ئاژەڵە بەسوودەکەی بەزۆر نەدەزانی، (واتە ئەوەی بۆ کەنیزەك و ئاژەڵەکەی ڕەوا دەدیت، بۆ کچەکەی خۆی ڕەوا نەدەبینی).

هەموو نرخ و بەهای ئافرەت لای ئەو کەسانەی کە دەیانهێشتەوە و نەیاندەکوشت لە منداڵیدا، تەنها ئەوەبوو: کە بەشێکە لە میرات و دەستبەدەستی لە باوکانەوە بۆ کوڕان‌و پێدەکرێت و دەفرۆشرێت و دەکرێتە بارمتەی قەرز، هیچ شتێك نەیدەپاراست و ڕێگر نەبوو لەم چارەنووسە، مەگەر ئافرەتی خێڵێك، یان بنەماڵەیەك بووبێت ڕێزی

لێگیرابێت وەك هەر شتێکی دیکە کە چاودێری و پاراستنی لە ئەستۆیاندا بووبێت) [(١)] .

هەموو ئەوانە بەراورد بکە بەو ڕۆڵە نوێ و ناوازەیەی ئیسلام گێڕاویەتی لە گێڕانەوەی ڕێز بۆ ئافرەت و دانانی لە پلەو پێگەی شایستەدا لە ناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و لە وەرگرتنەوەی مافەکانی و تۆڵەسەندنەوە لە هەموو یاسا و باوو نەریتە ستەمکارەکان و ئەنانییەتی پیاوان.

سەرنجدانێکی خێرا لە قورئانی پیرۆز بەسە بۆ پەیبردن بەو جیاوازییە زۆرەی نێوان نرخاندنی جاهیلی بۆ ئافرەت و نرخاندنی قورئانی و ئیسلامی بۆی، دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە هەموو ڕەفتارە تاکەکەسییەکان و یاساو ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان هەمیشە لەم نرخاندنەوە هەڵدەقوڵێن و لەسەری ڕادەوەستن.

ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا دەربارەی نیوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ڕەگەزی نەرم و ناسك هاتوون، وا لە ئافرەت دەکەن متمانەی بە پێگەی لە کۆمەڵگادا و بە پلەو پایەی لەلای خودا هەبێت، متمانەی بەوەش هەبێت کە دەتوانێت بگاتە بەرزترین پلە لە دینداریی و زانست و خزمەتی ئیسلام و هاریکارییکردن لەسەر چاکە و تەقوا و پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی چاك و پاك، ئەو ئایەتانە هەمیشە لەبارەی قەبوڵبوونی کار و کردەوەکان و ڕزگاری هەمیشەیی و بەختەوەری هەتاهەتایی و سەربەرزی دوارۆژدا باسی پیاو و ژن پێکەوە دەکەن.

---

(١) المرأة في القرآن، هي مامۆستا (عباس محمود العقاد) چاپی (دار الهلال – مصر) ل ٥١ – ٥٧.

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا) (النساء: ١٢٤).

واتە: (هەر کەسێك لە کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات، جا چ نێر بێت، یان مێ، لەحاڵێکدا ئەو کەسە ئیماندار بێت، ئەوا ئەوانە دەخرێنە بەهەشتەوە و بەقەدەر چاڵی ناوکە خورمایەك ستەمیان لێناکرێت)

هەروەها دەفەرموێت: (فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ) (آل عمران: ١٩٥).

(یەکسەر پەروەردگاریان وەڵامی نزاکانی دانەوە و فەرمووی: من کار و کردەوەی هیچ خاوەن کارێك بەزایە نادەم، لە نێر، یان لە مێ، هەندێکتان لە هەندێکی ترتانن).

هەروەها قورئانی پیرۆز، پیاو و ئافرەت هاوتا دەکات لە پێدانی دەرفەتەکان و هۆکارەکانی خۆشگوزەرانیدا، بەڵکو دەستەبەرکردنی هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی بۆ ئافرەت لە ئەستۆدەگرێت و بەڵێنی فەراهەمکردنی پێدەدات.

دەستەواژەی (الحياة الطيبة = خۆشگوزەرانی) وشەیەکی گشتی پڕمانایە، مانای ژیانێکی نموونەیی بەختەوەری کامەران دەبەخشێت و هەموو لایەنەکانی کەرامەت و خۆشنوودیی و خەیاڵی ئاسوودە و زۆر شتی دیکە دەگرێتەخۆ کە لە ژمارە نایەت: (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ) (النحل: ٩٧).

واتە: (هەر کەسێك کردەوەی چاکی کرد، چ نێر بێت، یان مێ، لە حاڵێکدا ئیماندار بێت، ئەوا دەیژیەنین بە ژیانێکی خۆش (بەخۆشگوزەرانی)

له دونیادا و له دوارۆژیشدا به باشتر لەوەی کە ئەوان دەیانکرد، پاداشتیان دەدەینەوە).

قورئانی پیرۆز سیفاتە بەرز و کارو کردەوە چاکەکان و لق و چڵەکانی دین باس دەکات و تەنها بەوەوە ڕاناوەستێت کە ئافرەت لەگەڵ پیاودا هاوتا بکات و ئاماژە بۆ ئەوە بکات، کە لە کردەوە چاکەکان و سیفەتە بەرزەکاندا جیاوازیی لە نێوان نێر و مێدا نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، سیفەتەکان تاك دەکاتەوە و یەك یەك باسیان دەکات، جا ئەگەر وەسفی نێرینەکان بکات، ئەوا بە هەمان سیفەت وەسفی ئافرەتەکانیش دەکات و بەجیا باسیان دەکات، هەر چەندە بەیانکردنەکە درێژەش بکێشێت، چونکە پێوانەکردنی ئافرەتان لە هەموو ئەم سیفەتانەدا بە نێرینە و پیاوانی بەهێز و دەوڵەمەند، شتێك بوو کە بیر و هۆشی خەڵك لەسەری ڕانەهاتبوو، ئەو بیر و هۆشانەی کە لە ژێر سایەی دیانەت و فەلسەفەو کۆمەڵگاو دابونەریتە کۆنەکاندا ـ چ دینی، یان ئەدەبی ـ گۆشکرابوون و هەمیشە جیاوازییان خستبووە نێوان پیاو و ئافرەتەوە و ئافرەتانیان جیاکردبۆوە لە بەشداریی پیاوان ـ چ جای شان لە شاندانی پیاوان و پێشکەوتنیان ـ لەزۆرێك لە بوارەکانی فەزیلەت و هیممەتبەرزیدا.

لەگەڵمدا فەرمایشتی خودای گەورە و کاربەجێ بخوێنەرەوە:(إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) (الأحزاب: ٣٥).

واتە: (بەڕاستی پیاوانی مسوڵمان و ئافرەتانی مسوڵمان، پیاوانی ئیماندار و ژنانی ئیماندار، پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ژنانی هەمیشە گوێڕایەڵ، پیاوانی ڕاستبێژ و ئافرەتانی ڕاستبێژ، پیاوانی ئارامگر و ژنانی ئارامگر، پیاوانی زەبوون و ژنانی زەبوون (بۆ خودا)، پیاوانی بەخشەر و ژنانی بەخشەر، پیاوانی ڕۆژووەوان و ژنانی ڕۆژووەوان، پیاوانی داوێنپارێز لە گوناهـ و ژنانی داوێنپارێز، پیاوانێك کە یادی خودا زۆر دەکەن و ژنانێك کە یادی خودا زۆر دەکەن، خودا لێخۆشبوون و پاداشتێکی هەرە مەزنی بۆ ئامادەکردوون).

قورئان هەر بەوەوە ناوەستێت کە ئافرەتان بکاتە هاوبەشی پیاوان لە خوداپەرستی و خۆنزیککردنەوە لە خودا، بەڵکو خوشکانی مسوڵمان دەکاتە هاوبەش لەگەڵ پیاوانی بەهێزی زانا، خاوەنی ئیرادەی پتەو و جوامێریی و هیممەتبەرزیی و ئارامگرتن لەسەر زەحمەت و ناڕەحەتییەکان، خۆخستنە ناو ڕووبەڕووبوونەوە لە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، قورئان لە پیاوانی ئیماندار و ژنانی ئیماندار گروپێکی پێکەوە بەستراو و یەکگرتوو یارمەتیدەری یەکدی لەسەر چاکە و تەقوا، دروست دەکات.

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (التوبة: ٧١).

واتە: (پیاوانی ئیماندار و ژنانی ئیماندار هەندێکیان پشتیوان و یارمەتیدەری هەندێکی دیکەیانن، فەرمان بە چاکە دەکەنو ڕێگری لە خراپە دەکەن، نوێژ دەکەنو زەکات دەدەن و گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی

(دروودی خوای لەسەر) دەکەن، ئا ئەوانە خودا ڕەحمیان پێدەکات و بەزەیی پێیاندا دێتەوە، بە ڕاستی خودا بەدەسەڵاتی دانا و کار بەجێیە).

قورئان تەقوا دەکاتە نموونەی تەواو و مەرجی گەیشتن بە پایەی بەرزی کەرامەتی ئینسانیی، بە چاوپۆشی لە ڕەگەز و رەچەڵەك و خوێن، وەکو دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) (الحجرات: ١٣).

واتە: (ئەی خەڵکینە، ئێمە لە نێرێك و مێیەك دروستمان کردوون و لەو دووانەوە کردوومانن بە چەند گەل و تیرەیەك تا یەکتر بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا بە تەقواترین و پارێزکارترینتانە، بەڕاستی خودا زانا و ئاگادارە).

هەموو ئەمانە کەفیلن بەوەی پاڵ بەهیممەتی ئافرەتانەوە بنێت و تیژی بکات و متمانەبەخۆبوون و شانازیی بەخۆکردن لە دڵو دەروونیدا بووروژێنێت و لەو بارە دەروونیەی لە زانستی دەروونناسی نوێدا پێی دەوترێت گرێی خۆبەکەمزانین (مرکب النقص = Inferiority Complex) دووركەوێتەوە.

بە فەزڵی ئەو ڕێنماییە قورئانی و ئیسلامییانەوە مێژوویەکی نوێ پەیدا بوو ــ لە دوای هاتنی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر) هەتا سەردەمێکی نزیك ــ پڕ لە شکۆمەندییەکانی خانمانی مسوڵمان[1]، مامۆستا، پەروەردەکار، جیهادکار (خەباتکار)، پەرستار، ئەدیبە، دانەر،

[1] تەماشای ئەو کتێبە تایبەتانە بکە کە لەسەر ئافرەتانی ناودار و خاوەن پایە نووسراون، وەك کتێبی (أعلام النساء في عالمي العروبة والإسلام) هی (عمر رضا کحالة) یە (١ ــ ٣) و (سيرة أم المؤمنين السيدة عائشة) هی زانای پایە بەرز سەیید سلێمانی نەدەوییە.

لەبەرکەری قورئان، گێڕەرەوەی فەرموودە، زاهیدەی ڕەببانی، ڕێزلێگیراوی سەنگین لە کۆمەڵدا، کە سوودیان لێوەردەگیرێت و دەکرێن بەسەر مەشق و بەنموونە دەهێنرێنەوە، ئەمما ئەو ماف و بەشانەی کە ئیسلام بەخشیونی بە ئافرەتی مسوڵمان گەلێ زۆرن، لەوانە: مافی خاوەندارێتی، میرات، سەربەستی لە کڕین و فرۆشتندا، مافی داواکردنی جیابوونەوە ئەگەر پێویست بێت (کە پێی دەوترێت خولع) مافی هەڵوەشاندنەوەی خوازبێنی ئەگەر بە داخوازیکەر ڕازی نەبوو، مافی ئامادەبوون لە مەراسیمی نوێژی جەژن و جومعە و جەماعەت و زۆر شتی دیکە کە کتێبەکانی (فیقه = شەرعزانیی) لە خۆیاندەگرن [٢] .

زانا بە ئینسافەکانی خۆرئاوا و توێژەرانی کۆمەڵناسی و توێژەرانی مێژووی شارستانیەتەکان (تأريخ المدنيات) دان بە تایبەتمەندیی ڕێنماییەکانی قورئان و شەریعەتی ئیسلامییدا لە ڕێزگرتنێکی نایابی ئافرەت و دانپێدانانی مافەکانی بە رەفتار و بە بڕیار، دەنێن.

ئێمە لێرەدا ئیکتیفا بە دوو شایەتیدان دەکەین، شایەتیدانی یەکەم هی خانمێکی خۆرئاوایی بە سەلیقەیە، کە لە هیندستاندا هەستا بە بزاڤێکی پەروەردەیی چاکسازیی و سەرۆکایەتی ڕێکخراوێکی فەرهەنگی و کەلتووریی دەکرد کە ناوەندەکەی لە باشووری هیند بوو، بەشداریی لە بزووتنەوەی ئازادیخوازیی هیندیدا کرد.

دیار و ڕوونیشە شایەتی ئافرەت نرخ و بەهای خۆی هەیە، لەبەر ئەو هەستیارییە زۆرەی کە لە دۆزی ئافرەتدا و لە بەرگریی لە هاوڕەگەزەکانی، هەیەتی.

---

[٢] بگەڕێوە بۆ کتێبی (المرأة بين الفقه والقانون)ی، دکتۆر موستەفا سوباعی بەڕەحمەت بێ.

ئەینی بێسانت (Mrs. Anni Besant) دەڵێت:

(بەڕاستی یاسکانی ئیسلامی لەو شتانەی پەیوەستن بە ئافرەتەوە لە بەرزترینو باشترین یاساکانە کە لە دونیادا دەرکەوتوون و لە هەمووشیان دادپەروەرانەترە، ئەو پێش یاسا خۆرئاواییەکان دەکەوێت لەو شتانەی پەیوەندی بە زەوی و زار و خانووبەرە و مافەکانی میرات و یاساکانی تەڵاقەوە هەیە، ئەو (یاساکانی ئیسلامی) پاسەوانی مافەکانی ئافرەتە. وشەکانی (قەناعەتکردن بە تاقەژنێك)، یان (چەندژنی) خەڵکی ئەفسووناوی کردووە و سەرنجیانی لاداوە لە بیرکردنەوە لەوەی کە خانمە خۆرئاواییەکان لە چی سووکایەتی و دژوارییەکدا دەژین، لەحاڵێکدا مێردە پێشینەکانیان کە بەرپرسیارن لە بەندی هاوسەرێتیان بەرەڵای سەر شەقامەکانیان کردوون دوای ئەوەی هەوەسی خۆیانیان لێشکاندوون، دەستیان لێبەرداون و لێیان بێتەماحن لەبەر بێزاریی و بێتاقەتبوون لێیان، جا دوای ئەو حاڵە نە یارمەتیی دەدرێن و نە بەزەییان لەگەڵ دەنوێنرێت)[1].

مامۆستا (N. L. Coulsen) دەڵێت:

(ئەوەی کە گومانی تێدا نییە: ئەو تەشریعاتە قورئانییانەی کە تایبەتن بە دیارییکردنی جێگە و پێگەی ئافرەتەوە ـ بەتایبەت ئەوانەیان کە شوویان کردووە ـ لە باشترینی یاساکانە و لە دادپەروەرترینیانە، بەڕاستی یاساکانی نیکاح و تەڵاق لە ژمارەیەکی زۆریدا، ئامانجی ئەوەیە ـ بەشێوەیەکی گشتی ـ جێگە و پێگەی ئافرەت باش بکات لە کۆمەڵگادا و پێشیانبخات، ئەم تەشریعاتانە هەستاون بە گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە لە یاساکانی عەرەبدا کە پێش ئیسلام سەروەر بوون، بەڕاستی ئافرەت

[1] The life and Teaching of Mohammed, madras – ١٩٣٢, P. ٣.

کەسایەتییەکی یاسایی سەربەخۆی پێبەخشرا کە لەوەوپێش خاوەنی شتی وا نەبووە و لە گەورەترین گۆڕانێکیش کە قورئان هێنایە کایەوە لە ئەحکامەکانی تەڵاقدا، یاسای عیددەکێشان بوو بۆ ئافرەتی تەڵاقدراو)[١] .

ئەم تێڕوانینە نوێیە بۆ ئافرەت و ڕێز بۆ دانان و مامەڵەکردن لەگەڵیدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەم بنەمایانە و ئەم ئایەتە قورئانییانە و ڕێنماییانەی پێغەمبەرییانەوە[٢]، لە دایکبوونێکی تازە بوو بۆ ڕەگەزی ئافرەتان لە جیهانی مرۆڤایەتیدا، چونکە ـ وەك لەوەوپێش باسمان کرد ـ لە جیهانی کۆندا جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەو و ئاژەڵێکی ماڵی، یان ئامێرێکی کەڕولاڵ، یان زیندەبەچاڵێك، یان بارمتەیەك، یان وێنەیەکی جوانو بووکەشووشەیەك لە کۆشکێکدا نەدەکرا، بۆیە موفاجەئەیەکی پیرۆز بوو لە جیهانی شارستانییەت و ئەخلاق و ژیانی ناوماڵ و پەیوەندی هاوسەرێتیدا.

کۆمەڵگا و وڵاتانێکی زۆر وەڵامیان هەبوو، زۆر، یان کەم پێی کاریگەر بوون، بەتایبەت ئەو وڵاتانەی ئیسلام لە ڕێگەی فەتح و غەزاوە چووبووە ناویان، یان حوکمڕانی و ڕێکخستنی کاروبارەوە، یان بانگەوازێکی چاکسازییەوە، یان وەك نموونەیەکی بەرجەستەی کرداری.

بەڕاستی گەورەیی ئەم خەڵاتە لە وڵاتانێکدا کە خانمان خۆیان بە ئاگر دەسووتاند ــ یان دەسووتێنران ــ لەبەر مردنی مێردەکانیان و هیچ مافێکیان بۆ خۆیان ڕەوا نەدەدیت، یان کۆمەڵگا پێیانی ڕەوا نەدەبینی لە دوای مردنی مێردەکانیان، زۆر ڕوون و ئاشکرایە و پێویستی بە قسە لەسەرکردن نییە.

---

[١] Islamic Surveys; The History of Islamic law(N. L. Coul–sen , Edimburg, ١٩٧١, P. ١٤)

[٢] تەماشای کتێبەکانی فەرموودە بکە، بابەکانی نیکاح و هەڵسوکەوت و ئەخلاق.

پاشایان و پیاوانی دەسەڵاتدار لە  مسوڵمانان هەستاون بە ڕۆڵی خۆیان لە چاککردنی ئەو مەراسیم و نەریتانەی کە لە هینددا پەیڕەویان لێدەکرا، بەتایبەت چاککردنی ئەو نەریتەی پێیدەوترا (ستی)، کە بریتی بوو لە خۆسووتاندنی بێوەژن لە کاتی سووتاندنی تەرمی مێردە مردووەکەیدا، ئەو چاکسازییانە بێئەوەی هیچ زیانێك بە بیروباوەڕە ئایینیەکان و مەراسیمە هیندییەکان بگەیەنن، یان حورمەتی کەس بشکێنن [٣] ، ئەنجامدراون .

دکتۆر (بەرنێر Bernier) پزیشك و گەڕۆکی بەناوبانگی فەرەنسی، کە سەردانی هیندی لە سەردەمی (شاهجەهان)دا کردووە، دەڵێت: (ژمارەی ڕووداوەکانی (ستی) تا ڕادەیەك کەمبووەتەوە، چونکە مسوڵمانەکان، ئەوانەی کە حوکمی ئەم وڵاتانە دەکەن، ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەخەنە کار بۆ لە ناوبردنی ئەم نەریتە دڕندانەیە، هەرچەندە هیچ یاسایەکیان دانەناوە بۆ ڕێگرتن لە ڕوودانی ئەم ڕووداوە، چونکە ئەوان ئامانجیان ئەوە نییە لە سیستمی حوکمڕانیاندا دەستبخەنە ناو کاروباری ئایینی هیندییەکانەوە، بەڵکو لێدەگەڕێن هەڵسن بە جێبەجێکردنی مەراسیم و ئەرکە ئایینیەکانیانو هەموو ئازادییەکیان بۆ دەستەبەر دەکەن، بەڵام هەوڵی وەستاندنی نەریتی (ستی) دەدەن بە ڕێگەیەکی ناڕاستەوخۆ، بەجۆرێك هیچ ئافرەتێك بۆی نییە خۆی پێشکەش بە (ستی) بکات هەتا مۆڵەت لە فەرمانڕەوای ویلایەتەکە وەرنەگرێت، فەرمانڕەواکەش ڕێگەی پێنادات تا تەواو دڵنیا نەبێت کە ئافرەتەکە لە هیچ حاڵێکدا لە بڕیارەکەی، پاشگەز نابێتەوە، جا فەرمانڕەواکە هەوڵ دەدات قەناعەت بە ئافرەتەکە

---

[٣] واتە لەبەر ئازادیی ئایینی و بیروڕا، مسوڵمانان زۆریان لە کەس نەکردووە و بە تۆبزی قەناعەتی خۆیان نەسەپاندووە. (طاهر).

بكات و لەسەر خواستەکەی لای بدات و لەبەر چاوی بخات، هەڕەشەی لێدەکات و تەماح دەخاتە بەریەوە، جا لەکاتێکدا هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو، کرداری قەناعەت پێکردن و هەڕەشە بەرهەمی نەبوو، ئافرەتەکە بۆ لای خێزان و کچەکانی دەنێرێت تا بچێتە ناو ئەوانو بەهۆی ئیقناعی ئەوانەوە بۆی، واز لە خواستەکەی بهێنێت، بەڵام وێڕای هەموو ئەم ڕێوشوێنانەی دەگێڕێتە بەر هەر هێشتا ڕووداوەکانی (ستی) بە زۆری ڕوودەدەن، بە تایبەت لە ناوچەکانی (ڕاجەوات = الأمراء) و ئەو شوێنانەی دەکەونەوە ژێر دەسەڵاتییانەوە، چونکە مسوڵمانان حوکمی تێدا ناکەن)[1] .

---

[1] گەشتەکەی دکتۆر بەرنێر، بەرگی دووەم / ل١٧٢.

پێنجەم شاکار ئەوەیە: زۆربەی تاکەکانی مرۆڤ تووشی نائومێدی لە بەزەیی خودا و بەدگومانیی بووبوون لە فیترەتی ساغی مرۆڤ، هەندێك لە ئایینە کۆنەکانی خۆرهەلاّت و مەسیحییەتی دەستکارییکرا و لە ئەوروپا و خۆرهەلاّتی ناوەڕاست ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لە هاوردنەکایەی ئەم کەشە تایبەتە و ئەم حالّەتە عەقلّییە تایبەتە، ئایینە کۆنەکان لە هیندستاندا باوەڕیان بە عەقیدەی دوناودۆن (تەناسوخ)[(١)] و فەلسەفەکەی هەبوو، کە بە پێی ئەم عەقیدەیە، بە شێوەیەکی ڕەها هیچ بوارێك بۆ ئیرادەی مرۆڤ و هەڵسوکەوتی نییە.

هەموو مرۆڤێك بە ناچاری دەبێت سزایەك بچێژێت لە تۆڵەی ئەو کردەوانەی کە لە ژیانی یەکەمیدا پێش خۆی خستووە، ئەویش بەدەرکەوتن لە شێوەی دڕندەیەکی راوکەری دڕدا، یان ئاژەڵێکی لەوەڕخۆر، یان گیانلەبەرێکی بێنرخ (وەکو: قالۆنچە و سیسرك و مارمێلکە و ئەو شتانەدا)[(٢)] یان مرۆڤێکی بەدبەختی نەگبەتی سزادراو.

ئەمە لە کاتێکدا مەسیحییەت بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد، کە مرۆڤ بە زگماکی و فیترەت[(٣)] یاخی و تاوانبارە و مەسیح بوو بە کەفارەت و

---

[(١)] تەناسوخ یان (تقمُّص): ئەو بیروباوەڕەیە کە دەڵێت: مرۆڤەکان کاتێك دەمرن رووحەکانیان لە لاشەیان جوودا دەبێتەوەو دەچێت بە بەری بوونەوەری تردا. بڕوانە(معجم العلوم الاجتماعية):٢٣٠. (طاهر).

[(٢)] ئەمەم بۆ ڕوونکردنەوە زیاد کردووە. (طاهر).

[(٣)] لە مەسیحیەتدا ئەو بیروباوەڕە هەیە کە ئادەم – علیه السلام – کاتێك لەو دارەی خوارد کە خودا لێی قەدەغە کردبوو، خوای گەورە لە بەهەشت دەری کرد بەهۆی ئەو گوناحەی کە کردی، ئەو گوناحەش لە ئادەمەوە گوازرایەوە بۆ وەچەکانی، هەموو کەسێك کە لە دایك دەبێت بەو گوناحەوە لە دایك دەبێت و خەتابارە، ئەمە بە درێژایی مێژوو هەر وابوو، مرۆڤ بە کۆت و بەندی ئەو گوناحەوە ژیانی بەسەر دەبرد، هەتا (نعوذ بالله) خودا کوڕەکەی

فیدای مرۆڤ له بری ئەو تاوانبارییەی، ئەم باوەڕەش ـ بەتەبیعەتی حاڵ ـ له دەروونی ملیۆنەها کەس لەوانەی کە لەجیهاندا باوەڕیان بە مەسیحییەت هێنابوو، بەدگومانی دەرهەق بە ناخ و دەروونی خۆیان و نائومێدیی له داهاتوویان و له بەزەیی خودای، دروست کردبوو.

ئا لەوێدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بە هەموو هێز و ڕاشکاوییەوە ڕایگەیاند: فیترەتی مرۆڤ وەك تابلۆیەکی پاك و ساف وایە، کە هێشتا هیچی لەسەر نەنووسرابێت و دەگونجێت جوانترین نەخشی تێدا بکێشرێت و جوانترین شتی لێ بسازێنرێت.

ڕایگەیاند: مرۆڤ خۆی ژیانی خۆی دەست پێدەکات و بنیاتی دەنێت، شایستەی پاداشت و سزا و بەهەشت و ئاگر دەبێت بەهۆی کردارەکانییەوە و بەرپرس نییە لە کرداری کەسانی دیکە، قورئانیش لە زۆر شوێندا باسی ئەوەی کردووە، کە مرۆڤ بەرپرسە لە کردەوەکانی خۆی و پاداشت دەدرێتەوە و لەسەر هەوڵەکانی سوپاس دەکرێت.

(أَلاَّ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى، وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى، وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى، ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاء الْأَوْفَى) (النجم: ٣٨ –٤١).

---

خۆی ـ بەلای دیانەکانەوە ـ کە مەسیحە نارد و کردی بە فیدا و قوربانیی و درا لە خاچ تا مرۆڤ بشواتەوە و ڕزگاری بکات لەو گوناحە زگماکییە.

ئەمە لە کاتێکدا ئیسلام ڕایگەیاندووە، کە خوای گەورە لە ئادەم – علیە السلام – خۆشبوو، دوای ئەوەی هاتە سەر ئەرز و داوای لێخۆشبوونی لە خودا کرد، هیچ کەسێك لە نەوەکانی کە لەدایك دەبن باجی ئەو گوناحە نادەن، بەڵکو هەموو منداڵێك بە پاکی و لە سەر فیترەتی باوەڕ بەخودابوون دێتە دونیاوە، مەگەر دواتر باوك و دایکی و هاوڕێ و دەوروبەر ئەو فیترەتە بشێوێنن. (طاهر)

واتە: (هیچ گوناهکارێك كۆڵ و گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێت، مرۆڤیش جگە لە هەوڵ و کۆششەکانی خۆی هیچی دیکەی بۆ نییە، بەڕاستی هەوڵەکانی لە داهاتوودا دەبینرێت و تەماشا دەکرێت، پاشان پاداشتی تەواویان لەسەر دەدرێتەوە).

ئەم ڕاگەیاندنە متمانەی ونبووی بە فیترەت و بەهرە سرووشتیەکانی بۆ مرۆڤ گێڕایەوە و بە عەزمێکی بەهێز و حەماسێکی زۆر و سۆزێکی بەجۆشەوە بەرەوپێش دەڕۆیی، تاوەکو ئایندەی خۆی و مرۆڤایەتی دروست بکات و بەخت و توانای لە هەموو ئەو توانا زۆر و ئەو هەلە بەنرخانەی کە خراوەتە بەردەستی، تاقی بکاتەوە.

بەڕاستی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) (بە فەرمانی خودا) بڕیاری دا، کە یاخیبوون و تاوانەکان و هەڵە و پێ خلیسکانەکان ماوەیەکی کورتە لە ژیانی مرۆڤدا و پاشان لادەچێت و دەڕوا، مرۆڤ هەندێك کات بەهۆی نەزانی و هەڵخەڵەتان و کورتبینییەوە دەکەوێتە نێویانەوە، هەندێك کاتیش بەهۆی هەڵخەڵەتاندنی شەیتان و فریودانی نەفسەوە، بەڵام چاکە و چاکەکاریی و دانانی بە تاواندا و پەشیمانبوونەوە، بنچینەیەکن لە بنچینەکانی فیترەتی مرۆڤو جەوهەری مرۆڤایەتییەکەی، بەڕاستی لاڵانەوە و پاڕانەوە لە خودا و بڕیاردانی بێ دوودڵی لەسەر نەگەڕانەوە بۆ سەر تاوان بەڵگەی شەرەف و پایەبەرزی مرۆڤ و ڕەسەنایەتی کانگاکەیەتی و ئەوە میرات و پاشماوەی باوە ئادەمە (علیە السلام).

محەممەد (دروودی خوای لەسەر) (بە فەرمانی خودا) دەرگایەکی فراوانی تەوبەی لە بەردەم ئەو مسوڵمانە (بگرە مرۆڤەکان بەگشتی)[1]

---

[1] زیادەیەکی پێویستە و بابەتەکە جوانتر ڕووندەکاتەوە. (طاهر)

خەتاكارانەی كە هەتا گوێچكەیان لە لە زۆنگاوی تاوان و خراپەكارییدا ڕۆچووە، ئاوەڵاكرد.

بانگهێشتی خەڵكی كرد بۆ تۆبەكردن، بانگهێشتێكی گشتی و ڕاڤەیەكی تێروتەسەلی فەزڵ و پایەی تۆبەی بۆ كردن و بەجوانی بۆ خەڵكی ڕوونكردەوە، كە دەتوانین بڵێین: ئەو بەو كارە پایەیەكی گەورەی لە دیندا زیندووكردەوە، بۆیە ناودەبرێت بە پێغەمبەری تەوبە (نبي التوبة)، كە ناوێكە لە نێوان هەموو ناوە جوانەكانی دیكەیدا، ئەو بانگی بۆ تۆبەكردن نەكرد كە هەر هۆكار و ئامرازێكی ناچاری بێت و مرۆڤ بۆ پێڕاگەیشتن بەو شتانەی كە لە دەستی ڕۆیشتوون پەنای بۆ ببات، بەڵكو پایەی تەوبەی بەرزكردەوە هەتا بوو بە باشترین عیبادەت و نزیكبوونەوە لە خودا، بوو بە ڕێگایەكی ئاسان بۆ گەیشتن بە ئەوپەڕی پلەكانی نزیكی لە خواوە و پلەكانی ویلایەت لە كەمترین كاتدا، كە عابید و زاهید و بێگوناهـ و پاكەكان لە بەندەكانی خودا ئێرەییان پێببێت.

قورئانی پیرۆز راڤەی فەزڵ و فراوانی تەوبەی كرد و باسی پاكبوونەوەی مرۆڤی كرد لە گەورەترین تاوان و مەزنترین سەرپێچی كە مرۆڤ وێنای بكات، ئەوەش بە شێوازێكی جوانی دڵڕفێن، بانگی سەرپێچیكار و تاوانبار و گرفتارانی نەفس و شەیتانی كرد بۆ پەنابردن بۆ خودا و ڕاكردن بەرەو لای و خۆخستنە ژێر سایەی ڕەحمەتییەوە و خۆهاویشتنە بەر لوتف و بەزەیی ئەوەوە.

هەروەها قورئان باسی دەریای پڕ و فراوانی ڕەحمەتی خودای كرد كە دەورەی سەرجەم كەسەكان و بوونەوەری داوە، باسكردنێكی ناوازە و قەشەنگ و تاسە پەیداكەر و وروژێنەر، كە ئەوەی لێوە ڕوون دەبێتەوە:

که خودای پەروەردگار هەر حەلیم و بەبەزەیی و بەخشندە نییە و بەس، بەڵکو سەرەڕای ئەوە ـ ئەگەر ئەم دەربڕینە تەواوبێت ـ خوای گەورە تۆبەکارانی خۆش دەوێت و موشتاقی دیداریانە و سوپاسی هەوڵ و کۆششیان دەکات (واتە پاداشتیان دەداتەوە)، هەموو ڕێزێکیان بۆ دادەنێت.

ئەم ئایەتەی خوارەوە بخوێنەرەوە و تام و چێژی ئەم شێوازە ناسك و بەسۆزە، ئەو کەشی خۆشەویستییە بکە کە دایدەپۆشێت.

(قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ) (الزمر: ٥٣).

واتە: (ئەی محەممەد، ئەم بانگەوازەی من بدە بە بەندەکانم ڕابگەیەنە: ئەی بەندەکانم، ئەوانەی کە زیادەڕۆییتان کردووە لە گوناح و ستەم لە خۆکردن، نائومێد مەبن لە ڕەحمەت و بەزەیی خودا، (چونکە) بێگومان خودا لە سەرجەم گوناهەکان دەبوورێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بەبەزەیی).

خوای گەورە سەرەڕای ئەوە لەم ئایەتەی خوارەوەدا باسی کۆمەڵانێکی جۆراوجۆر لە بەندە چاکەکانی دەکات، تۆبەکارانی خستۆتە پێشەوەی ئەم لیستە پرشنگدار و نوورانیەوە، کە دەفەرموویێت: (التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدونَ الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ) (التوبة: ١١٢).

واتە : (ئیماندارانی ڕاستەقینە کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، ئەمانەن: تۆبەکاران، خواپەرستان، سوپاسگوزاران، ڕۆژووەوانان (یان گەشتیاران و کۆچەران لە تاعەتی خودادا)، سەرنەویکاران (الراكعون)، کڕنوشبەران،

فەرماندەران بە چاکە و ڕێگرییکاران لە خراپە، پارێزەرانی سنوورەکانی خودا، جا موژدە بدە بەو ئیماندارانەی هەڵگری ئەم سیفاتانەن).

ئەم ڕێزگرتن و ئەم پاککردنەوەیەی بەندەی تۆبەکار لە تاوانەکانی و دەرخستنی متمانە پێکردنی زۆر بەڕوونی دەرکەوت کاتێك قورئانی پیرۆز گیرابوونی تۆبەی سێ هەوەڵەکەی پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر) ڕاگەیاند، ئەو سێ کەسەی کە لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن و بێ هیچ عوزرێکی وەرگیراوی دروست لە شاری مەدینە مانەوە، جا قورئان دەستی کرد بە باسکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و کۆچکەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە لەم غەزایەدا دوانەکەوتبوون، پاشان یەکسەر بەدوایاندا باسی ئەو سێ هاوەڵەی کرد کە دواکەوتبوون، تا ئەمانە هەست بەوە نەکەن کە تاککراونەتەوە لە تۆبەکەیاندا و بۆ ئەوەی هەست بە سووکی نەکەن و هەست بەوە نەکەن کە لە دەروونناسییدا پێی دەوترێت: (گرێی خۆبەکەمزانین)، هەروەها بۆ ئەوەش کە هەتا ڕۆژی قیامەت بۆ ئیمانداران ڕوونبێتەوە کە جێگە و پایەی ئەوان لە ڕیزی پێشەوەی ڕاستگۆ و ڕاستکردارە یەکەمینەکانی کۆچکەران و پشتیوانانن، جا هیچ پێویست بە شەرمەزاریی ناکات و جێگەی نەنگی نییە.

ئایا بەڕاست هیچ نموونەیەك لە مێژووی ئایین و بەها و ڕەوشت و پەروەردە و چاکسازییدا لەم نموونەیە قەشەنگتر و جوانتر، ورتر، قووڵتر، شیرنتر، گەشتر بۆ وەرگیرانی تۆبە و ڕێزگرتنی تۆبەکار و لابردنی پەردەی دڵتەنگی تۆبەکار بە نەرمونیانی و سۆز و خۆشەویستی و بەزەییەوە، هەیە.

لەگەڵمدا ئەم ئایەتانە بخوێنەوە:

(لَقَد تَّابَ الله عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالآنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ، وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الآرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) (التوبة: ١١٧– ١١٨).

واتە: (بەڕاستی خودا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و ئەو کۆچەر و پشتیوانانەی کە لە کاتی تەنگانە و ناڕەحەتیدا شوێنی کەوتن، دوای ئەوەی خەریکبوو دڵی کۆمەڵێکیان بترازێت و لەحەق لابدات، پاشان خودا تەوبەی لێوەرگرتن، بەڕاستی خودا لەگەڵیان بە بەزەییو میهرەبانە، هەروەها تەوبەشی وەرگرت لەو سێ کەسەی کە بەجێمان و دواکەوتن هەتا ـ بەهۆی ئەو سەرپێچییەوە ـ زەوییان بەو فراوانیەوە لەسەر تەنگ بوو، دڵ و دەروونیشیان سەغڵەت بوو و زانیان هیچ پەناگایەك نییە لە سزای خودا جگە لە پەنای خۆی، پاشان تەوفیقی دان بۆ تۆبەکردن تاوەکو بگەڕێنەوەو تۆبە بکەن و ئەویش تۆبەکەیان لێوەرگرێت، بەڕاستی خودا زۆر تۆبەوەرگر و میهرەبانە).

پاش ئەمەش قورئان وەك بنەمایەکی گشتی ڕایگەیاند کە ڕەحمەتی خودا هەموو شت دەگرێتەوە و دەکەوێتە پێش تووڕەییەکەی. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ)(الأعراف: ١٥٦).

واتە: ڕەحمەت و بەزەییم هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

لە فەرموودەی قودسیشدا هاتووە: (إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي) [١]

واتە: ( بەڕاستی بەزەیی من پێش تووڕەییم کەوتووە).

---

[١] رواه مسلم.

قورئان نائومێدیی کردۆته هاوتا و هاوواتای کوفر و گومڕایی و نەفامی، ئەوەشی لەسەر زمانی یەعقوب (علیه السلام) ڕوونکردۆتەوە.

(إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ) (يوسف: ٨٧).

واتە: (بەڕاستی نائومێد نابێت لە ڕەحمەت و میهرەبانیی خودا جگە لە کۆمەڵانی بێباوەڕ).

لە جێگایەکی دیکەدا باسی گوتەی ئیبراهیم (علیه السلام)ی کردووە: (وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّآلُّونَ) (الحجر: ٥٦).

واتە: (..وە کێ لە ڕەحمەتی پەروەردگاری نائومێد دەبێت، جگە لە گومڕایان).

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بەم بانگەوازە کراوە گشتییەی بۆ تەوبەکردن و ڕوونکردنەوەی چاکییەکانی و فراوانییەکەی و گشتگیرییەکەی فریای مرۆڤایەتی ترسا و و تۆقیو کەوت، ئەو مرۆڤایەتییەی کە لە ژێر فشار و کاریگەریی نائومێدیی و بێهیواییدا دەینالاند و لە ترسی هەڕەشەکانی سزاو ئازارچەشتن و دیمەنەکانی شکۆمەندی و تووڕەیی هەڵدەلەرزی، لەمەشدا زاناکانی جوولەکە و ڕاڤەکارانی کتێبە پیرۆزەکان و ڕاهیبە زیادەڕۆکانی مەسیحییەت گەورەترین پشکیان هەبوو.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەرفەتێکی نوێ و جوانی لە ژیان پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد و ڕۆحێکی نوێ و گەرموگوڕییەکی تازەی خستە دڵی لاواز و سست و لاشەی ساردوسڕی ئەم مرۆڤایەتییەوە و مەرهەمی بۆ برینەکانی ئامادەکرد، لە ناو خاك و خۆڵدا دەریهێنا و بەرزی کردەوە بۆ ترۆپکی سەروەری و سەرداریێتی و متمانە و شانازیی بەخۆوەکردن و پشت بە خودا بەستن.

# شەشەم

# کۆکردنەوەی دین و دونیا پێکەوە و یەکخستنی ڕیزە لێکسڵەمیوەکان و سەربازگە بەشەڕهاتووەکان

ئايينە كۆنـەكان، بەتايبـەت مەسـيحييەت، ژيـانی مرۆڤيـان بـۆ دوو بـەش دابـەش كردبـوو: بەشـێكی بـۆ ئـايين و بەشـێكی بـۆ دونيـا، گـۆی زوييـان كردبــووە دوو ســەربازگە: ســەربازگەی پيــاوانی ئــاين (رجــال الــدين)، سەربازگەی پياوانی دونيا.

ئەم دوو سەربازگەيە هەر لە يەك جودا نەبوون و بەس، بەڵكو كەندواوێكی گەورە لە يەكيانی دابڕيبوو، بەربەستێكی ئەستووريش لە نێوانياندا قيت بووبووەوە، بەم شێوەيە و بە بەردەوام بەيەكدا هەڵدەپژان و دوژمنايەتی يەكتريان دەكردو هەر يەكەيان باوەڕی وابوو كە ڕقەبەرێتی و دژايەتی لە نێوان دين و دونيادا هەيە، جا (لەسەر بنەمای ئەم تێڕوانينە) ئەگەر مرۆڤێك ويستبای پەيوەندی بە يەكێكيانەوە بكات، ئەوا لەسەری پێويست بوو پەيوەندی لەگەڵ ئەوی ديكەيان بپچڕێنێت، نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو دەبوو لە بەرانبەريدا جەنگ رابگەيەنێت، چونكە ناگونجێت ـ بەپێی گوتەی ئەوان ـ لەيەككاتدا سواری دوو كەشتی بێت، هيچ ڕێگايەكيش نييە بگيرێتەبەر بۆ هەوڵو ڕەنج خۆشگوزەرانی ئابووريی بێئەوەی سەرقاڵی و بێئاگايی لە خانەی دوارۆژ تيا ڕوونەدات و پشتكردنی لە وەديهێنەری ئاسمانەكان و زەمينی تێدا نەبێت.

هەروەها هيچ حوكم و دەسەڵاتێك بەردەوامی و مانەوەی نابێت ئەگەر ڕێنما ئايينی و ڕەوشتييەكان پشتگوێ نەخات و خۆی دانەماڵێ لە ترسان لە خودا، هيچ دينداريیەكيش ئيمكان نابێت بەبێ ڕەهبانيەت و بڕينی پەيوەندی لەگەڵ دونيا و هەرچی وا لە ناويدايە.

ديار و ئاشكرايە: مرۆڤ حەز بە خۆشگوزەرانی دەكات و لەسەر ئەوە دروستكراوە (واتە سروشتی وايە) جا هەر بيرۆكەيەكی ئايينی ڕێگە نەدات

به بەهرەمەند بوون لە خۆشییە حەڵاڵ و ڕێگەپێدراوەکان و هەستانەوە و پێشکەوتن و سەروەریی و دەستخستنی هێز و دەسەڵات، ئەوا زۆر جار لەگەڵ جۆری مرۆڤایەتیدا ناگونجێت.

ئەوە کێشمەکێشە لەگەڵ بیرۆکەی ڕاست و دروستدا و کپکردنی غەریزە سروشتییە پاکەکانە لە مرۆڤدا.

دەرەنجامی ئەم کێشمە کێشە ئەوەبوو: ژمارەی هەرە زۆری خاوەن زرنگی و زیرەکی و توانا زانستییەکان دونیایان هەڵبژارد بەسەر ئاییندا و پێی ڕازی بوون ـ وەك پێویستییەکی کۆمەڵایەتی و واقیعێکی بەرهەست ـ و متمانەیان پێکرد و کەوتنە چاککردن و بایەخدان بەم ژیانە و وەدەستهێنانی خۆشی و چێژەکانی و هیچ هیوایەکیان بە بڵندبوونەوەی ئایینی و پێشکەتنی ڕۆحی نەما.

زۆربەی ئەو کەسانەی بە شێوەیەکی گشتی لە ئایین گەڕابوون و وازیان لێهێنابوو، لەسەر بناغەی ئەو تێکگیران (تناقض)ـە بوو کە بە ڕاستییەکی سەلمێنراوی بەڵگەنەویستیان دانابوو، دەسەڵاتدارانی کۆشکی حوکمڕانیی کە سەرکردایەتی حوکمی ئایینیان دەکرد هەڵگەڕانەوە و شۆڕشیان لە دژی کەنیسە بەرپاکرد کە نوێنەرایەتی ئایینی دەکرد و بەتەواوی خۆیان لەهەموو کۆت و بەندێك داماڵی، دەرەنجام بە شوێن ئەواندا سەرجەم حکومەتەکان شۆڕشیان کرد و هەڵچوون، وەکو فیلێکی تووڕە و سەرشێت کە لە زنجیر و بەندەکانی دەرباز بووبێت، یان وەك حوشترێك کە جڵەوەکەی بەسەر شانەوە بێت و بەرەو شوێنێکی نادیار غار بدات.

ئەم لێکترازان و جوودابوونەوە بێسوودەی نێوان دین و دونیاو ئەو دوژمنایەتییە شوومەی نێوان (پیاوانی دین) و (پیاوانی دونیا) دەرگای

خسته سەر پشت بۆ ئیلحاد و بێدینی و یەکەمین نێچیریش خۆر ئاوابوو، دووەمیش، ئەو گەل و نەتەوانە بوون کە کەوتنە ژێر کاریگەریی ڕۆژئاواوە لە فیکر و زانست و فەرهەنگ و کەلتووردا، یان لە ژێر ئالای خۆرئاوادا گوزەرانیان کردبێت و ژیابێتن.

ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کردەوە بانگەوازکارە توندڕە و زیادەڕۆکانی مەسیحییەت بوون، ئەوانەی فیترەت و سروشتی مرۆڤیان بە گەورەترین کۆسپ دادەنا لەبەردەم پاکژیی ڕۆحی و پەیوەندییکردن بە ئاسمانەوە، ئەوانەی کە هەموو هەوڵی خۆیان خستەکار بۆ بەگومڕا دانانی سروشتی مرۆڤو ئازاردانی بە جۆرەها ئەحکامی دژوار و توندوتیژ و ڕێنمایی ستەمکارانە [1]، وێنەیەکی دڕندانەی لێوهەڵقرچاوی دانگڕی ترسێنەریان لە دین پێشانی خەڵکی دا، کە تەزووی بە لاشەدا دەهێنا و پێستی کرژ دەکرد.

سەرەنجام لە کۆتاییدا سەری کێشا بۆ چوونەوەیەك و کەمبوونەوەی سێبەری دین و پەرستنی نەفس و ئارەزووەکان ـ بەفراوانترین مانا ـ تا گەیشتە ترۆپکە و دونیا لە نێوان دوو جەمسەری دژ بەیەك هەلۆرکەی دەکرد (تتأرجح) تا لە کۆتاییدا (دونیا) لەبەر لاوازیی پاڵنەری ئایینی کەوتە خوارەوە، یان بەهۆی لەدەستدانی هەستی ئایینی کەوتە کەنەلانێکی قووڵی بێدینی و فەوزایەکی گشتی ڕەوشتییەوە [2].

لە گەورەترین خەلات و چاکە مەزنەکانی فروستادەیی محەممەد و هاوار و بانگەکەی کە نرکەی هەموو ئاسۆکانی گرتەوە، ئەوەیە کە: بناغەی هەموو

---

[1] مێژووی ئەخلاقی ئەوروپا بخوێنەوە، بەرگی دوو کە هی لیکی یە Lecky.

[2] بۆ زیاتر زانیاری کتێبی ((الصراع بين الدين والعلم)) بخوێنەرەوە کە هی درابەری ئەمریکییە. Conflict between Religion & Science by John William Draber.

کردار و ڕەوشتێك بریتییە لەو ئامانجەی کە مرۆڤ مەبەستێتی، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بە تاقە وشەیەکی سادە، بەڵام فراوان و قووڵ لە مانادا، دەریبڕیوە: ئەویش وشەی (نیەت = نیان)ـە، وەك فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئٍ ما نوى) [٣].

واتە: (کار و کردەوەکان بە گوێرەی نیەتی خاوەنەکەیەتی و هەر کەسێکیش تەنها پاداشتی ئەوە وەردەگرێت کە نیەتی لێهێناوە).

هەر کردەوەیەك کە مرۆڤ پێی هەڵدەسێت و ئەنجامی دەدات لەبەر ڕەزامەندی خودا و بە پاڵنەری نیازپاکی و جێبەجێکردنی فەرمانی خودا و گوێڕایەڵییکردنی، ئەوە هۆکارێکە بۆ نزیك بوونەوە لە خودا و گەیشتن بە بەرزترین پایەکانی یەقین و پلەکانی ئیمان.

ئەم کردەوانە کە بەم شێوەیە ئەنجام بدرێن ئەوە دینداریییەکە پاك و بێگەردە و هیچ خڵتە و خەوشێکی تێدا نییە، جا چ جیهاد و کوشتار بێت، یان حوکمڕانی و بەڕێوەبردن، یان چێژوەرگرتن بێت بە شتە پاك و خۆشەکانی زەوییەوە، یان هاوردنەدی خواستەکانی نەفس بێت، یان هەوڵدان بێت بۆ گەڕان بە شوێن رزق و ڕۆزی و وەزیفەدا، یان تاسە شکاندنێك بێت بە ڕەواندنەوەی خەم و پەژارەکان بە ڕێگەیەکی دروست و حەڵاڵ، یان خۆسەرقاڵکردن بێت بە ژیانی خێزانداریی و هاوسەرییەوە.

بەپێچەوانەشەوە، هەر عیبادەت و خزمەتێکی دینی بە دونیایی دادەنرێت ئەگەر لە خواستی ڕەزامەندی خودا و ملکەچیی بۆ فەرمان و نەهییەکانی داماڵرابێت و پەردەی بێئاگایی و بیرچوونی دواڕۆژ داپۆشی بێت، هەرچەندە ئەو کارانە نوێژە فەرزەکان بێت، یان هیجرەت و جیهاد، یان زیکر

---

[٣] صحيح البخاري.

و تەسبیحات، ئەنجامدەرەکەشی پاداشتی چاکەی نادرێتەوە، چ زانا بێت یان موجاهید، یان بانگخواز، بەڵکو ڕەنگە ئەو کردەوە و خزمەتانە ببنە بارگرانی و سەرەنجامی خراپ بەسەر خاوەنەکەیانەوە، یان ببنە پەردەیەك لە نێوان ئەو و خودادا.

ئەمە چیرۆکی نەصرانیەت بوو لە چاخەکانی ناوەڕاستدا کە کەنیسە ـ نوێنەری دین بوو ـ لەگەڵ حکومەتدا لە دوو جەمسەری دژ بە یەکدا بوون و لە نێوانیاندا ڕقەبەرایەتی و ململانێیەکی توند بەرپا بوو، بە جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت کۆتاییهات، دەرئەنجامەکەی ئەوە بوو کە هەموولایەك دەیزانن و تا ئێستاش هەموو جیهان ئازاری (داخماکەی)[1] دەچێژێت و لە ڕێگەی ئاسوودەیی ڕاستەقینەدا بۆتە کۆسپ و تەگەرە.

دکتۆر محەممەد ئیقبال[2] بە جوانی وێنەی ئەم حەقیقەتە مێژووییەی کێشاوە، کە دەڵێت: (کەنیسە لەسەر بناغەی ڕەهبانیەت ڕاوەستا بوو، بۆیە– بە سروشت – جێگەی سەرکردایەتی و سەروەرایەتی و حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی تێدا نەبوویەوە، چونکە دوژمنایەتی و ناکۆکییەکی دێرین لە نێوان ڕەهبانیەت و حوکمدا هەبوو، ئەمیان (واتە ڕەهبانیەت) ملکەچی و خۆبەدەستەوەدان بوو، ئەویان (واتە حکومڕانی) بەرزبوونەوە و دەستبەسەراگرتن بوو.

---

(١) داخما ئەو شوێنەیە کە بە کانزایەکی گەرمکراو، یان پشکۆیەك داخ کرابێت. (طاهر).

(٢) موحەممەد ئیقبال: (١٨٧٦ – ١٩٣٨ز)، لە بەناوبانگترین شاعیر و فەیلەسوف و بیرمەندانی مسوڵمان بوو لە هیندستاندا، بانگی دەکرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی پاکستانی و سەربەخۆبوون لە هیندستان، چەندین کتێب و دیوانە شیعری هەیە بە فارسی و ئوردیی. بڕوانە (المنجد في الأعلام: ٥٨). (طاهر).

سیاسەت لە کۆتاییدا خۆی قوتار کرد لەدەستی دین و لێی دەرچوو، وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، پیاوانی کەهەنووتیش دەستەوسان بوون لەبەردەم ئەم بارودۆخەدا و هیچیان پێنەدەکرا.

کاتێکیش دین لە دەوڵەت جیابووەوە، ئارەزوو و شەهوەت هاتنە پێش و هەوا و هەوەس تەشەنەی کردو بڵاوبووەوە و یاسای دارستان سەروەر بوو، ئەم لێکدابڕان و جیابوونەوەیە نەگبەتی و شوومییە بۆ سەر دین و دەوڵەتیش، دەلالەت لەسەر لاوازی دیدی ئەم شارستانیەتە و[1] خراپیی زەوق و چەشتنی دەکات، بەڵام موعجیزەی پیاوێك لە پیاوەکانی بیابان کە لە یەککاتدا موژدەدەرو ترسێنەر بوو، لەوەدا دەرکەوت کە لە موژدەکەیدا ئینزار و ترساندن و لە ترساندنەکەیدا موژدە و مزگێنی هەبوو.

مرۆڤایەتی پارێزراو نابێت لەو مەترسییانەی هەڕەشەی لێدەکات و هیچ ڕێگایەکیش بۆ هەستانەوەی نییە بەوە نەبێت کە زاهید و خواپەرستەکانیش لەگەڵ سوارەکانی سەر زینی ئەسپ و سەر پشتی ماینەکاندا بکەونەڕێ)[2].

یەکێکی دیکە لە شاکارە نەمرەکانی سەروەرمان محەممەد (درووودی خوای لەسەر) ئەوەیە: کە ئەم کەلێنە گەورەیەی نێوان دین و دونیای پڕکردەوە، وای لەم دوو جەمسەرە لێکسڵەمیوە لێکراکردووە کرد کە لە ڕقەبەرییەکی هەمیشە و دوژمنایەتییەکی بێپەردە و کینەیەکی بەردەوامدا دەژیان، بە هۆگریی و خۆشەویستییەوە باوەش بەیەکدا بکەن و پێکەوە بە ئاشتی و تەبایی بژین.

---

[1] مەبەستی شارستانیەتی خۆرئاوایە کە دین و دەوڵەتی لێکجوودا کردەوە. (طاهر)

[2] روائع إقبال (طبعة دار إبن كثير الأولى، دمشق – بيروت ١٩٩٩م).

سەروەرمان (دروودی خوای لەسەر) پێغەمبەری یەکێتی و یەکخستنە، لەیەککاتدا موژدەدەر و ترسێنەرە، مرۆڤایەتی لە دوو سەربازگەی دژ بەیەکەوە کرد بەیەك بەرەی یەکگرتوو لە ئیمان و خودا مەبەستبوون و دڵسۆزیی و پەرۆشی بۆ مرۆڤایەتی و خواستنی ڕەزامەندی خودا.

ئەم پاڕانەوە کۆکەرەوە فراوانە دەسەوسانکەر (مُعجِز)ەی فێر کردین: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) (البقرة: ٢٠١).

واتە: (ئەی پەروەردگارا، هەم لە دونیا و هەم لە دواڕۆژیشدا خێر و خۆشی و باشمان پێبدە و لە سزای ئاگریش بمانپارێزە).

ئەو بەم ئایەتە قورئانییە: (إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (الأنعام: ١٦٢)

واتە: (بەڕاستی نوێژو قوربانیی و ژیان و مردنم هەر بۆ خودایە، پەروەردگاری جیهانیان).

ڕایگەیاند کە ژیانی ئیماندار کۆمەڵە یەکەیەکی لێکجودا و دژ بە یەك نییە، بەڵکو تەنها یەکەیەکە، گیانی خواپەرستیی و خوامەبەستبوون بەسەریدا زاڵە و ئیمان بە خودا پێشەنگی دەکات و ئیسلامیش بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا پەلکێشی دەکات.

ئەم تەنها یەکەیە تەواوی کایەو لقەکانی ژیان لە خۆدەگرێت لەگەڵ سەرجەم مەیدانەکانی هەوڵدان و بەرخوردان و هەموو جۆرە کار و پیشەیەك، بەمەرجێك دڵسۆزیی و نیازی دروست و بە تەنها خودا

مەبەستبوونی تیا بەدی بێت، سەرەڕای ئەمانەش، لەسەر پەیڕەو و مەنهەجی ڕاست و دروست بێت کە پێغەمبەران [(١)] هێناویانە.

ئەم جاڕدان و ڕاگەیاندنەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەو پێغەمبەری یەکێتی و تەبایی و پێکەوە گونجانە بە تەواوەتی، ئەو لەیەککاتدا موژدەدەر و ترسێنەرە و تێڕوانینی جیابوونەوەی دین لە دونیای لەناوبرد، هەموو ژیانی کردە خواپەرستی و هەموو زەوی گێڕا بە مزگەوت و دەستی مرۆڤی گرت و لە سەربازگە ڕکابەر و بەشەڕهاتووەکانەوە گواستیەوە بۆ یەك بەرەی فراوان لە کار و کردەوەی باش و خزمەتکردنێکی بەسوودی مرۆڤایەتی و خوا لەخۆڕازیکردن.

جا لە دەرئەنجامی ئەم یەکخستنەوە پاشایانیان لە پەڵاسی هەژاران و زاهیدانیش لە بەرگی پاشایاندا دەبینی، فەرماندەکانیان دەبینی شاخێکن لە حیلم و نەرمونیانی و کانیاو و سەرچاوەی زانیارین، خواپەرستی شەو و

---

(١) باشتر وابوو بڵێت: لەسەر مەنهەجی پێغەمبەر بێت ـ واتە بە تاك، نەك بە کۆ ـ چونکە پێغەمبەران لە عەقیدە و ئیماندا بانگەوازەکەیان هاوبەشە، بەڵام لە شەریعەت و مەنهەجدا، هەر پێغەمبەرە و شەریعەت و مەنهەجی خۆی هەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ (المائدە: ٤٨). واتە:((دامانناوە بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و پەیڕەوێکی ڕوون و دیار)).

کە هەر ئوممەتێك شەریعەت و مەنهەجێکی تایبەتی هەبێت، دیارە ئەو شەریعەت و مەنهەجەشیان لە پێغەمبەرەکەیانەوە وەرگرتووە، کەواتە: هەر پێغەمبەرە، مەنهەج و شەریعەتی تایبەتی خۆی هەیە، خودای گەورە بە پێغەمبەری خۆمان (موحەممەد(ﷺ)) دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (الجاثية: ١٨). واتە: ((.. پاشان تۆمان خستە سەر شەریعەتێك لەبارەی کاروباری ئایینیەوە، تۆش شوێنی بکەوە و شوێن هەوەس و ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نەزانن)). (طاهر).

جیهادکار و ئەسپسواری ڕۆژن، ئەمەش بەبێ هیچ تێکگیران و گرانی و خەلەل و کەموکورتی و قەیرانێك[٢] .

---

[٢] باشترین نموونەش بۆ کەسانێك ئەم سیفەتانەیان تێدا بەرجەستە بووبێت، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بوون، کە لەبەردەستی خۆیدا پەروەردەی کردبوون، ئەو نەوەیەی سەید قوتب ناویان لێدەنێت جيل قرآني ٌ فريد = نەوەی قورئانیی بێوێنە).

ئیمامی عومەر خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی بوو چەندەها پینە بە کراسەکەیەوە بوو، خۆی حوشتری زەکاتی تیمار دەکرد، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفیش باشترین زاهید بوو خاوەنی سەروەت و سامانی زۆر بوو، هەر هەمووشیان عابیدی باش بوون و زۆربەیان بەشەو شەونوێژیان دەکرد و ڕاز و نیازیان لەگەڵ خودادا دەکرد و بە ڕۆژیش پاڵەوانی مەیدان و پیاوانی بەجەربەزەی کوفرشکێن بوون، ڕەزای خودا لە هەموویان و ئێمەش لەگەڵ ئەواندا لە بەهەشتی بەریندا کۆبکاتەوە. (طاهر).

# حەوتەم

## هێنانەکایەی پەیوەندییەکی پیرۆزی هەمیشەیی لە نێوان ئایین و زانستدا و بەستنەوەی ئایندەی هەریەکەیان بە ئەوی دیکەیانەوە و ڕێزنان و مەزن تەماشاکردنی زانست و هاندان لەسەر بەدەستهێنانی

یەکێکی دیکـە لـە شـاکارە نـەمرەکانی سـەرورەمان محەممـەد (دروودی خـــوای لەســـەر) و یـــەکێك لـــە تایبەتمەندییـــەکانی پێغەمبەرایـــەتی و بانگەوازەکەی ئەوەیە: کە ئەو زاتە مەزنە پەیوەندییەکی پیرۆزی هەمیشەیی لە نێوان دین و زانستدا دامەزرانـد و ئاینـدەی هەریەکـەیانی بـەوی دیکـەوە بەستەوە و پلـەو پایـەی زانسـتی گـەورە کـرد، بـە شـێوازێك هانیـدا لەسـەر وەدەستهێنانی کەس لەوە زیاتری نەکردبێت.

دەرئەنجامە سروشتییەکەی هاتنەکایەی بزاڤێکی زانستی و کتێبنووسی بوو، کە وێنەی نییە لە مێژووی ئەو دەوران و شارستانیەتانەی لە سەر بناغەی دین و پەیامە ئاسمانییەکان دامەزرابوون.

گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەوە: یەکەم وەحی، کە دابەزیە سەر سەروەرمان محەممەد (دروودی خوای لەسەر)، وەدیهێنەری بوونەوەر چاکە و مننەتی نا بەسەر مرۆڤایەتیدا بەوەی ئەو وەحییەی تایبەتمەند کرد بە زانست و زانیاری.

لەو وەحیەدا باسی ئامرازی هەرە گەورەی زانستی کرد (واتە: قەڵەم) کە مێژووی زانست و کاروانی زانیاری پێوەبەندە، لەمەشەوە بزووتنەوەیەکی دانان و فێرکردن هەڵقولا، زانست لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە و لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی دیکە و لە چاخێکەوە بۆ چاخێکی دیکە و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، گوازرایەوە.

چاکەی بڵاوبوونەوەی بەجیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەحیەی دابەزییە سەر سەروەرمان، هەروەها فەزڵی پەخشبوونی بەفراوانترین سنووردا وەك چاکە و فەزیلەیەك، یان پێویستیەك لە پێویستیە مەعنەوییەکانی مرۆڤایەتی

هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەحییە و پاشانیش جیهانی خوێندگا و زانکۆ و خانەکانی زانست و کتێبخانەکانی لەسەر دامەزرا.

هەموو پێشبینییە مێژوویی و عەقڵییەکان ــ ئەگەر کار بە پێشبینی و ئەندازەکاری مرۆیی بکرێت ــ بە دووری دەزانی لە دوو توێی یەکەمین وەحییدا باسی قەڵەم بکرێت، لە کاتێکدا ئەم وەحییە دائەبەزییە سەر نەخوێندەوارێك لە ناو ئوممەتێکی نەخوێندەواردا و لە چەند ناوچەیەکی جیاجیادا، کە هیچ شتێك تیایدا زیاتر نامۆ و دەگمەن نەبوو لەو پارچە دارەی کە پێی دەوترێت (قەڵەم)، ئەمە لەکاتێکدا نازناوی بڵاوی عەرەب (أُمّيين = نەخوێندەوارەکان) بوو. (هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ) (الجمعة: ٢).

واتە: ( ئەوە ئەو زاتەیە کە لە نێو نەخوێندەوارەکاندا هەر لە خۆیان پێغەمبەرێکی ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە و پاکیان دەکاتەوە، وە فێری قورئان و داناییان (فەرموودە پڕ داناییەکانیان) دەکات، هەرچەندە لەوەوپێش لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون).

قورئانیش قسەی جوولەکەکان دەگێڕێتەوە کە دراوسێی عەرەب بوون لەمەدینەدا و بە حوکمی دراوسێیەتی و پێکەوەژیان عەرەبەکانیان دەناسی: (لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ) (آل عمران: ٧٥).

واتە: (جوولەکەکان دەیانوت: هیچمان لەسەر نییە ئەگەر ماڵی ئوممییەکان بخۆین).

لە ناو ئەم ئوممەتەدا پێغەمبەر ــ کە وەحی بۆ دابەزی ــ بە ئوممی تەواو دەناسرا، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا

كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (الشورى: ٥٢).

واته: (هەر بەهەمان شێوە (كەوەحی پێدێتە خوار) قورئانمان بۆ ناردی (ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) لە فەرمانی خۆمان، كە تۆ نەتدەزانی كتێب و ئیمان چییە، بەڵام ئێمە ئەوەمان كردە ڕووناكییەك ڕێنمایی هەر كەسێكی پێدەكەین لە بەندەكانی خۆمان كە بمانەوێت، بەڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنمایی دەكەی بۆ سەر ڕێگایەكی ڕاست).

هەروەها دەفەرموێت: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلاَ تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لاَّرْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨).

واته: (تۆ (ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر)، پێش ئەم قورئانە هیچ كتێبێكت نەدەخوێندەوە و بە دەستی ڕاستت نەت نووسیوە، (ئەگەر وابووایە) ئەو كاتە ناڕاستەكان (پووچەڵخوازەكان) دەكەوتنە گومانەوە كە ڕەنگە قورئان خۆت داتنابێت).

ئەو وەحییەی یەكەمجار لە ئەشكەوتی (حِراء) دابەزی بۆ سەر پێغەمبەری نەخوێندەوار بریتی بوو لە پەیوەندی كردنی زەمین بە ئاسمانەوە، یان گونجاوتر بڵێین پەیوەندییكردنی ئاسمان بوو بەزەوییەوە، ئەمەش دوای دابڕانێكی ماوە درێژ بوو كە شەش سەدەی خایاند [١]، ئەم وەحییە یەكەمجار فەرمانی بە عیبادەت، یان ناسینی خودا و گوێڕایەڵیكردنی، یان بانگەوازكردن بۆ لای خودا نەكرد، كە ئەمانە هەمووی كاری ئیجابین، هەروەها بانگی نەكرد بۆ وەلانانی بت و بتپەرستی، یان

---

[١] بریتییە لەو ماوەیەی كە بە سەر پێغەمبەرایەتی سەروەرمان (عیسى)دا تێپەڕی (سەلاتو سەلامی خوا لەسەر ئەو و پێغەمبەری ئێمەش بێت).

بانگی لەناوچوونی جاهیلیەت و دابونەریتەکانی هەڵنەدا کە کۆمەڵە کارێکی سەلبی بوون، ئەگەر واشی بکردایە هەمووی لەجێگەی خۆیدا بوو، بەڵام ئەم وەحییە بە وشەی (إقرأ =بخوێنە) دەستیپێکرد.

(اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الآكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) (العلق: ١–٥).

واتە: (ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە کە دروستی کردووە، دروستی کردووە مرۆڤ لە خوێنپارەیەك، بخوێنە و پەروەردگارت لە هەموو کەس بەخشندەترە، ئەوەی کە مرۆڤی فێرکرد بە قەڵەم، مرۆڤی فێری ئەو شتانە کرد کە نەیدەزانین).

ئەمە ڕووداوێکی مەزن بوو لە ڕووداوە مێژووییەکان، چەندەها ئاسۆی بەرینی نوێ لە بیرکردنەوەی مرۆڤ و تێڕامانی بیرمەندان و مێژوونووسان دەکاتەوە و ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەوەی کە ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە (دروودی خوای لەسەر) دەورانێکی نوێ دەکاتەوە لە مێژووی مرۆڤایەتی و مێژووی ئایین و پەیامە ئاسمانییەکاندا.

ئەم دەورانە سیمای خوێندەواری بە فراوانترین و قووڵترین مانا پێوەیە، سیمای بەرپابوونی دەوڵەتی زانست و دەسپێکردنی سەردەمێکی پرشنگداری پێوەیە، بە تەریبکردن و لەپاڵ یەکدانانی ئایین و زانست، هەردووکیان دەبنە هاوەڵی یەکتر و یارمەتی یەکدی دەدەن لە دارشتنەوەی مرۆڤایەتیی تازە و نوێدا، بەڵام هەڵقوڵانی هونەری خوێندەواری و زانست لە باوەشی ئەم پێغەمبەرایەتییەوە دەبێت و بە ناوی ئەو پەروەردگارەوە دەبێت کە ئەم بوونەوەرەو مرۆڤیشی دروستکردووە، مۆرکی ئیمان بەخودا

و ناسینی ڕاستەقینەی ئەوی پێوەیە و لەبەر ڕێنمایی ئەودا بەرەو پێشەوە ڕێگە دەبڕێت، وەك فەرموویەتی:

(اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق: ١).

واتە: (ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە (هەموو شتی) دروستکردووە).

ئەمە لە حالێکدا خوای پەروەردگار شارەزایە بە حەقیقەت و خیلقەتی مرۆڤ، جا بۆیە داوای لێدەکات کە بە ناوی خوداوە دەست بەخوێندن بکات، تاوەکو لە قاوغی خۆی دەرنەچێت و تووشی سەرکەشی و لەخۆباییبوون نەبێت بەهۆی داهێنان و سەرکەوتنەکانیەوە لەبواری زانست و عەقڵ و پیشەسازیی و هۆکارەکانی ڕام کردنی گەردووندا. وەك فەرموویەتی: (خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ) (العلق: ٢).

واتە: (مرۆڤی دروستی کردووە لە خوێنپارەیەك = پارچە خوێنێکی بەستوو).

پاشان پایەی قەڵەمی بەرزکردەوەو ئاماژەی بە بەهاو نرخ و ڕۆڵی گەورەی لە جیهانی زانست و خوێندن و فێرکردن و پەروەردەدا کرد، ئەو قەڵەمەی کە پەیداکردن و دەستخستنی لە مەککەو دوورگەی عەرەبیدا کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو تایبەت بوو بە ژمارەیەکی کەمی سنووردار [١]، بۆیە خوێندەوار لە دوورگەی عەرەبیدا پێی دەوترا (کاتب = نووسەر).

---

[١] ئەوانەی کە خوێندن و نووسینیان دەزانی لە هۆزی قوڕەیشدا تەنها ١٧ کەس بوون، وەك لە کتێبی (العقد الفرید)دا هاتووە ٢٤٢/٤ کە دانەرەکەی (ابن عبد ربه) و لە کتێبی (فتوح البلدان)ی (البلاذری) ل٤٥٧ دا هاتووە، هەرچەندە هەندێك لە توێژەرە نوێیەکان بۆ ئەوە دەچن کە ژمارەکە لەوە زیاتر بێت، بەڵام بەهەرحاڵ، هێشتا هەر ژمارەکە کەمو سنووردارە.

خوای گەورە فەرموویەتی: (الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ) (العلق: ٤). واتە: (ئەو زاتەی کە مرۆڤی فێرکرد بە قەڵەم).

پاشان ئاماژەی کرد بۆ لە بارپی و شایستەیی مرۆڤ بۆ فێربوونی زانستی نویێو نوێتر لە راستییەکانی ئایینی و گەردوونی و زانستە جۆر بەجۆرەکان و پیشەکان و دۆزینەوەکان و داهێنانەکان و فراوانکردنی ئاسۆی زانست و زانیاری.

سەرچاوەی هەموو ئەوانەش فێرکردنی خودایی و ئامادەکردن و شیاندنی مرۆڤە لەلایەن ئەوەوە بۆ فێربوونی شتە نادیارەکان و دۆزینەوەی ونەکان، وەك فەرموویەتی:

(عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) (العلق: ٥). واتە: (خودا ئەو شتانەی فێری مرۆڤـ کرد کە نەیدەزانی).

ئەمە سەرەتا و دەسپێکی وەحی دابەزێنراوی سەر محەممەد (دروودی خوای لەسەر) بوو، سەرەتا و سەرباسیش کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر هەموو ئەو قۆناغانەی کە لەوەودوا دێن، هەروەها کاریگەری هەیە لەسەر ئەو سروشتەی کە زاڵ دەبێت بەسەر زانستێك، یان بانگەوازێك، یان قوتابخانەیەکدا، جا بۆیە ئەم دینە هەر بە هاوتای زانست مایەوە — دەمێنێتەوە — و هاوڕێ و هاودەمی بووە، لەگەڵ حەزی مرۆڤدا ڕۆیشتووە لە فێربوون و توانای لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە نوێیەکاندا کە دێنە سەر ڕێگای نەوەکانی مرۆڤایەتی و عەقڵی ئینسانی و مەدەنیەت و شارستانیەتی چاك و لەبار، بێ قەڵسبوون و ڕووگرژ کردن لە زانست و بێ ترس لە کارو کرداری عەقڵ.

چەندەها ئایین هەیە ژیانی خۆی لە مردن و لەناوچوونی زانستدا دەبینێت، هەروەها گەشەکردن و سەرکەوتنی خۆی لە نسکۆ و شکستی زانستدا دەبینێت، هەر بە وێنەی ئەم بەسەرهاتەی کە دەڵێت: مێشوولەیەك سکاڵای بردە لای سەرورەرمان سلێمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر) لە دەست ڕەشە با، وتی: با زۆر زوڵم و ستەممان لێ دەکات، ئێمەی مێشوولە مانەوەمان لەگەڵ ئەودا نییە، هەر کاتێك هەڵکات ناچارین پەنا بۆ هەڵهاتن بەرین.

سەرورەرمان سلێمان وتی: دەبێت داوا لەسەرکراو (المدّعی علیە) بانگ بکرێ و لێرە ئامادەبێت.

بانگی بای کرد و یەکسەر مێشوولەکان فڕین و ڕۆیشتن، جا وتی: چۆن بڕیار لەسەر کێشەیەك بدەین کە داواکار (المدعی) ئامادە نەبێت ؟.

خاوەنی زۆرێك لە ئایینەکانیش هەروان، لەپێش هەمووشیانەوە دیانەتی براهمایی (هیندۆکی ) و کاهین و سەدەنەکانی لە هیندستاندا.

چیرۆکی ململانێی نێوان کەنیسەی مەسیحیەت و زانست لە ئەوروپادا زۆر بەناوبانگ و بڵاوە، کتێبەکەی درابەری ئەمریکی: (کێشمەکێش لە نێوان ئاین و زانستدا_الصراع بین الدین والعلم = Conflict between Religion & Science.) یەکێکە لە بەڵگەنامە مێژوویی و کتێبە ڕێڕوونکەرەوەکان، کە پڕیەتی لە زانیاریی و رووناکی زۆر، ژمارەی قوربانییانی دادگاکانی پشکنین (محاکم التفتیش)[1] (Courts of Inquiston) لە ئەوروپای

[1] دادگاکانی پشکنین (محاکم التفتیش): بیرمەندان بە گەورەترین پەڵەی ڕەشی دادەنێن بە نێوچەوانی مێژووی نەسرانییەتەوە، بیرۆکەی داهێنانی ئەم دادگایانە هی ڕاهیبەکانی دۆمینیکان بوو لە ئیسپانیا و زۆربەی ئەندامانیان پێکدەهێنا.

هەر ئەمانیش بوون ئەم دادگایانەیان گواستەوە بۆ هەریەکە لە مەکسیك و پیرۆ و لە جیهانی مەسیحییەتدا بڵاویانکردەوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەمی زایینی و بەردەوام بوو، تا لە سەدەی نۆزدەدا یوسف پۆناپارت لە ساڵی ١٨٣٤ز بە تەواوەتی هەڵیوەشاندەوە، واتە (١٠) سەدەی ڕەبەق خۆیان بەسەر خەڵکیدا سەپاندبوو.

بڕیاری دامەزراندنی (دادگاکانی پشکنین) لە دەسەڵاتی پاپادا بوو، ئەویش لە هەر وڵاتێك (پشکنەر)ێکی گشتی دادەنا بۆ سەرپەرشتی ئەو دادگایانە، ئەویش لای خۆیەوە هەڵئەسا بە دانانی سەرۆك و ئەندامانی دادگای هەرێمەکان، کار و پیشەی ئەم دادگایانە بریتی بوو لە بڕیارەکانی: بێبەشکردن (الحرمان) و، دەستگرتن بەسەر سامانی هاووڵاتیاندا و دەستبەسەرکردنی زۆرەملێ (الإقامة الجبرية) و قەدەغە کردنی بڵاوکردنەوە (النشر) و سووتاندنی دانراو و کتێبەکان و سزادان و سووکایەتی پێکردن.

سەرەڕای ئەمانەش ـ وەك لە وشەی پشکنیندا دەخوێندرێتەوە ـ بەدوای بیروڕای شاراوەی نێو دڵ و عەقڵ و ناخی خەڵکدا دەگەڕان تاوەکو لە سەر ئەو بیروڕاو بۆچوونانە لێپێچینەوە لەگەڵ خاوەنەکانیاندا بکەن.

قوربانییانی ئەم دادگایانە بریتی بوون لە: مسوڵمانان کە لە سەرەتاوە بۆ بنبڕکردنی ئەوان دامەزرێنران، ئەویش دوای کەوتنی مەمالیکی ئیسلامی لەئیسپانیادا، بەلایانەوە ئاسایی بوو کە جوولەکەکانیش بگرێتەوە، پاشان دەسەڵاتی ئەم دادگایانە فراوان بوو تاوەکو ئەوانەشی گرتەوە کە لە نەصرانییەت جیادەبوونەوە، یان بیروبۆچوونێکیان دەردەبڕی کە لەگەڵ بۆچوونی کەنیسەدا نەدەگونجا، ئەمانەش بریتی بوون لە: بیرمەند و فەیلەسوف و زاناکان لە هەریەکە لە وڵاتانی ئیتاڵیا، فەڕەنسا، ئیسپانیا، پورتوگال، ئەڵمانیا و هۆڵەندەدا.

ئەم دادگایانە دەسەڵاتەکانی بەکاردەهێنا بۆ نابووت کردن و سزادان و کوشتنی دوژمنەکانی و لەناوبردنی ئازادیی بیروڕا.

ئەم دادگایە ئەگەر بیرمەندێك، یان زانایەك، یان فەیلەسوفێکی دەستگیربکردایە، ئەوا دوو شاهێدی ناحەقی بانگ دەکرد و شایەتییان لەسەر دەدا، جائەگەر تۆبەی بکردایە و پەشیمان بووایەتەوە، ئەوا دوای ڕیسواکردن و شەلاق لێدان و سەرشۆڕکردن وازیان لێدەهێنا و لێی دەگەڕان، بەڵام ئەگەر سوور بووایە لەسەر بیروبۆچوونەکانی و بەرگریی لەخۆی بکردایە، ئەوا سزایان دەدا و بڕیاری لەخاچدانی هەتا مردنیان بەسەر خۆی و ـ هەندێکجار ـ خێزانەکەشیدا دەداو پاشان تەرمەکەشیان دەسووتاند (Holocaust) ، یان هەر بە زیندوویی دەیانسووتان (autodafe) ، یان بڕیاری بەندکردنیان بە کۆتکراوی لە جێگەیەکی تەنگ و تاریکدا، بەسەردا دەسەپاند.

سەدەکانی ناوەڕاست و چەوساندنەوەی کەنەیسە گەیشتە ١٢ ملیۆن[١] کەس، ئەمەش دوو ئەوەندەی ژمارەی قوربانییەکانی جەنگی جیهانی یەکەمە، کە گەیشتە شەش ملیۆن و ٤٠٠ هەزار کەس.

قورئان دابەزی و ڕێزی زانستی بەرز ڕاگرت، پایەی زانایانی بڵند کردەوە تا پلەیەکی هێندە بەرز کە نموونەی لە کتێب و ئایینەکانی پێش خۆیدا نەبوو، ئەوەندە وەسف و پێداهەڵدانی بۆ زانست و زانایان کرد تا گەیاندنیە پلەیەك لە خوار پلەی پێغەمبەرایەتی و لەسەرووی هەموو پلەیەك لە پلەکانی مرۆڤ.

---

بڕوانە: (المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفة، د. عبد المنعم الحفني، مكتبة مدبولي، ط٣، ٢٠٠٠م محكمة التفتيش = Inquistion )ل٧٥٢-٧٥٣.

دیارە ئەمەش یەکێکی دیکە بوو لەو هۆکارە زۆرانەی بوون بە هۆی وەلانان و دژایەتی مەسیحییەت لە ئەوروپا و دژایەتیی ئایین بەشێوەیەکی گشتی و سەرهەڵدانی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت لە وڵاتانی ئەوروپیدا. پاشان لە ڕێگەی هێرشی سەربازیی و شاڵاوی فراوانخوازی داگیرکاری (إستعماری) و لەژێر زەبری ئاگر و ئاسندا بیرۆکەی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت لە ئەوروپاوە گوازرایەوە بۆ وڵاتانی ئیسلامی و بەزۆری هێز بە سەریاندا سەپێنرا، ئەویش لە ڕێگەی هەڵوەشاندنەوەی دادگا شەرعییەکان و گۆڕینی یاسا ئیسلامییەکان بەیاسا ئەوروپییەکان، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەیشەوە لەڕێگەی غەزوی فیکرییەوە کە لەلایەن زۆرێك لە خۆرهەڵاتناس و ڕێکخراوە تەبشیرییەکانەوە کاری بۆ دەکرا، کە شانبەشانی ئیستیعمار و بگرە پێشتریش و تا ئێستاش درێژەی هەیە، ئەویش بەچەواشەکردن و سەرلێشێواندنی ڕۆڵەی مسوڵمانان و هاندانی بۆ بەراوردکردنی ئیسلام لەسەر مەسیحییەت و دژایەتیکردنی ئاینی ئیسلامی لە وڵاتانی ئیسلامیدا، ئەمە لەکاتێکد کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هیچ کاتێك دژایەتی پێشکەوتن و زانستی نەکردووە، بگرە هانی داوە لەسەری‌و پێویست کردووە، بە ئایەتی﴿ لا إكراه في الدين﴾یش مرۆڤی سەرپشك کردووە لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕی ئایینی و هەرگیز ڕێگەی لە دەربڕینی بیروڕای بنیاتنەر و بەسوود نەگرتووە. (طاهر)

[١] John Davenport: Apology for Muhammad & Quran.

بۆ خوێنەر بەسە کە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە بخوێنێتەوە: (شَهِدَاللّهُ أَنَّهُ لاَإِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)(آل عمران:١٨). واتە: (خودا شاهێدی دەدات (ڕایدەگەیەنێت و بە بەڵگە دەیسەلمێنێت) کە هیچ پەرستراوێك شایستەی پەرستن نییە جگە لە ئەو، فریشتەکانیش شاهێدی دەدەن (دەیسەلمێنن) و زانایانیش شایەتی دەدەن (ئیمانیان هێناوە و خەڵکی بۆ بانگ دەکەن بە بەڵگە و بەرچاوڕوونییەوە)، لە حاڵێکدا خودا دادپەروەری ڕاگرتووە لە بڕیار و حوکم و تەقسیماتیدا، هیچ پەرستراوێك بەڕاستی شایانی پەرستن نییە ئەو نەبێت، ئەوە زاڵی کار بەجێ).

هەروەها ئەم فەرمایشتەی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی: (وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا) (طه: ١١٤).

واتە: (تۆ ئەی محەممەد (درودی خوای لەسەر) بڵێ: ئەی پەروەردگارم زانستو زانیارییم زۆر بکە).

هەروەرها فەرموویەتی: (قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ) (الزمر: ٩).

واتە: (ئەی محەممەد(درودی خوای لەسەر) بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن وەکو یەکن؟! واتە: وەکو یەك نین).

وە دەفەرموێت: (يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ) (المجادلة:١١).

واتە: (خودا پایەی ئەو کەسانە بەرزدەکاتەوە لە ئێوە کە بڕواتان هێناوە و ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، بەچەند پلەیەك).

هەروەها دەفەرموێت: (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) (فاطر: ٢٨).

واتە: (لە ناو بەندەکانی خوادا بەس زاناکان (وەك پێویست) لە خودا دەترسن).

لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا (درووودی خوای لەسەر) بۆ خوێنەر بەسە کە ئەم فەرمایشتە بخوێنێتەوە: (فضل العالم على العابد كفضلي على أدناكم)[1].

واتە: (فەزڵی زانا بەسەر عابید و خواپەرستەوە وەك فەزڵی من وایە بەسەر نزمترین کەسەوە لە ئێوە).

هەروەها ئەم فەرمایشتەی کە سەروەرمان دەفەرموێت: (إن العلماء ورثة الأنبياء، وإن الأنبياء لم يورّثوا ديناراً ولادِرْهماً، وإنما ورّثوا العلم، فمن أخذه أخذ بحظ وافر)[2].

واتە: (بەڕاستی زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینار و درهەمیان بەمیرات بەجێنەهێشتووە، بەڵکو بە تەنها زانستیان بە میرات بەجێهێشتووە، جا هەر کەسێك زانست و زانیاری وەربگرێت ئەوا بەشێکی زۆری لەو میراتە وەرگرتووە).

لەم ئاماژەکردن و پێداهەڵدانەدا دەربارەی پلەوپایەی زانست، ئەو چالاکییەی لێهەڵقولا، یان بە وشەیەکی ڕاستر بڵێین: ئەو حەماسەتە زانستی و خۆبەختکردنەی لەڕێگەی زانستدا لەمێژووی ئیسلامدا لێهەڵقولا، ئەو بزاڤە زانستییە جیهانییە نەمرەی لێوە تەشەنەی کرد کە ڕووبەرە زەمەنییەکەی گەورەتر و فراوانترە لەهەر ڕووبەرێکی زەمەنیی دیکە و ڕووبەرە

---

[1] رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.

[2] صحيح: رواه أبو داود و الترمذي.

شوێنییەکەی (المساحة المكانية) فراوانترە لەهەر ڕووبەرە شوێنییەکی دیکە و ڕووبەرە مەعنەوییەکەشی فراوانترە لەهەردوو ڕووبەرەکەی دیکە [٣] .

لێرەشدا شاهێدی لێکۆڵەرێکی گەورەی خۆرئاوای و مێژوونووسێکی بەناوبانگی فەڕەنسی بە بەس دەزانین، کە ئەویش دکتۆر (گۆستاف لۆبۆن)ە کە لەکتێبە بەناوبانگەکەی (حضارة العرب) دا دەڵێت:

(مرۆڤ سەرسام دەبێت لەو هیممەتەی کە عەرەب [١] پێی چووەتە پێش لە لێکۆڵینەوەدا، ئەگەر گەلانێکیش هەبن کە لەو بوارەدا یەکسان بن لەگەڵ

---

[٣] بۆ زانیاری دەربارەی ئەم ڕووبەرانە و زانینی بابەتە ڕەنگاوڕەنگەکان، بگەڕێوە بۆ ئەو کتێبانەی باسی ئەو دانراوانە دەکات کە زانایانی ئیسلام لە چاخ و ناوچە جۆراوجۆرەکاندا دایاننا وە، ئێمە هەندێکیان بەنموونە دێنینەوە:

وەك: کتێبی ((الفهرست))ی ئیبن‌وننەدیم، (کشف الظنون)ی حاجی خەلیفە چەلەبی، (معجم المصنفين)ی مەحمود حەسەن تونکی کە (شەست بەرگە و ٢٠ هەزار لاپەڕە لەخۆدەگرێت لەگەڵ ژیانی ٤٠ هەزار دانەر)، (الثقافة الإسلامية في الهند) کە هی زانای گەورە (العلامة) سەید عەبدولحەی ئەلحەسەنییە، (طبع مجمع اللغات العربية بدمشق) و (تأريخ الأدب العربي) کە هی بروکلمانی ئەڵمانییە و (تأريخ التراث العربي) کە هی فوئاد سەزگینە.

[١] زۆرێك لە نووسەر و مێژوونووسان و خۆرهەڵاتناسە خۆرئاواییەکان وشەی (عەرەب) بەکاردەهێنن لە بری وشەی ( مسوڵمان )، هەروەها لە بری شارستانییەتی ئیسلامی، وشەی شارستانییەتی عەرەبی بەکاردەهێنن، ئەمەش هەندێکیان بە ئەنقەست ئەوە دەکەن ـ بەتایبەت زۆرێك لەخۆرهەڵاتناسەکان ـ بۆ ئەوەی گەلانی مسوڵمان کە شانبەشانی عەرەب جیهادیان کردووە و دەوڵەت و شارستانییەتی ئیسلامییان دروستکردووە، گرفت و لێکترازان لە نێوانیاندا دروست بێت و هاندەر بێت بۆ عەرەبە شۆڤێنییەکان بڵێن: ئەو شارستانییەتە بە تەنها هی عەرەبە، لەبەرانبەردا کاردانەوە لای گەلانی دیکە دروست بێت و رق و قین لە دڵیاندا بەرانبەر عەرەب چەکەرە بکات و ساردیان بکاتەوە لە هەوڵدان بۆ دروستکردنەوە و بنیاتنانەوەی شارستانیەتێکی هاوشێوەی ئەوەی لە مێژوودا هەبووە.

جا لە هەر شوێنێکدا هاوشێوەی ئەم گوزارشتەت بینی، چ لەم کتێبەدا، یان لەسەرچاوەی دیکەدا، ئەم تێبینییە ڕەچاو بکە. (طاهر).

عەرەبدا، بەڵام هیچیان نەکەوتوونەتە سەرووی عەرەبەوە لەوەی کە ئەوان دەیخەنە سەر شان.

عەرەبەکان ئەگەر دەستیان بەسەر شارێکدا بگرتایە، بیر و هۆشیان لە دروستکردنی مزگەوت و دامەزراندنی قوتابخانەدا بەکاردەهێنا، جا ئەگەر ئەو شارە گەورە بوایە ژمارەیەکی زۆر قوتابخانەیان تێدا بنیات دەنا، لەوانەش ئەو بیست قوتابخانەیەی کە بنیامین تەتەبلی (ساڵی ١١٧٣ ز وەفاتی کردووە) دەیگێڕێتەوە کە خۆی لە شاری ئەسکەندەرییەدا بینیویەتی، ئەمە جگە لەوەی کە شارە گەورەکانی وەکو بەغدا، قاهیرە، تولەیتلە و قورتوبە... هتد، چەندەها زانکۆیان لە خۆگرتبوو، کە هەریەکە لەو زانکۆیانە تاقیگە، روانگەی ئەستێرەکان (المرصد) و کتێبخانەگەلی دەوڵەمەندی هەر شتێك کە یارمەتی توێژینەوەی زانستی بدایە، لەخۆدەگرت.

عەرەبەکان تەنها لە ئیسپانیادا حەفتا کتێبخانەی گشتییان هەبوو، کتێبخانەکەی خەلیفە (حەکەمی دووەم) لە قورتوبە ٦٠٠ هەزار کتێبی تێدا بوو، لەوانە وەك مێژوونووسەکانی عەرەب گێڕاویانەتەوە ٤٤ بەرگی فێهرەست بوون، هەر بۆیەش وتراوە بەهۆی ئەوەوە (شارل)ی دانا نەیتوانیوە دوای ٤٠٠ ساڵ زیاتر لە ٩٠٠ بەرگ لە کتێبخانەی شاهانەی فەرەنسادا کۆبکاتەوە، کە نزیکەی سێ یەکی تایبەت بوو بە زانستی لاهووتەوە) [1]، (واتە: زانستی ئیلاهیات).

---

[1] حضارة العرب. دانانی: دکتۆر گۆستاف لۆبۆن، وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی: مامۆستا عادل زعێتەر، چاپخانەی (عیسی البابي الحلبي وشرکاه) لە میسر: ل٤٣٤.

ڕۆڵی فروستادەیی محەممەد و بانگەوازی ئیسلامی لە ئاڕاستەکردنی زانستدا بەرەو ئامانجی ڕاست و دروست و هەڵنانی لەسەر ئەنجامدانی ڕۆڵی ئەرێنی (إيجابی) بنیاتنەر و سوودمەند و بەکەڵك و ڕزگارکەر لە دوودڵی و نیگەرانی و تێکگیران (التناقض) و گومان، گرنگییەکی گەورەتر و بەهای زیاتری هەیە لەو ڕۆڵەی کە گێڕاویەتی لە چالاککردنی بزاڤی زانستی و فراوانکردنی.

ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە یەکەکانی زانست (وحدات العلم) پەرش و بڵاوبوون، بگرە لە هەندێککاتدا دژ بەیەك بوون، زانستی سروشت (سروشتناسی) دژ بە ئاین بوو، زانستی دانایی (علم الحكمه) دژایەتی ئایینی دەکرد، تەنانەت زانستەکانی بیرکاری و پزیشکی کە زانستگەلی بێلایەنن، هەندێکجار خاوەن پسپۆڕییەکان تیایاندا بە دەرئەنجامی نەرێنی (سلبی) و ئیلحادییەوە دەردەچوون.

لە یۆناندا کە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لە سەرووی جیهانی هاوچەرخی خۆیەوە بوو لە زانستەکانی فەلسەفە و بیرکاریدا، چەندین زانا هەبوون، یان هاوبەشدانەر (موشريك) بوون، یان مولحید و بێ باوەڕ، زانست و قوتابخانە فیکرییەکانی بووبوونە مەترسی بۆ سەر ئایین و بەڵگە و پێشەنگ بۆ مولحیدەکان. جا لە گەورەترین چاکەکانی ئیسلام ئەوە بوو ڕێنمایی مرۆڤایەتی کرد بۆ ناسینی ئەویەکەیەی (یان ئەو بەندەی) کە هەموو یەکەکانی دیکەی زانست پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەوەشی بۆچووە سەر و بۆی مەیسەر بوو، چونکە ئەو گەشتەکەی لە بواری زانست و مەعریفەدا بە سەرەتایەکی ڕاست و دروست، بە گەشتەکەی بە باوەڕبوون بە خودا و کۆمەك خواستن لێی و پشتبەستن پێی، دەستپێکرد، ئەمەش کارکردن بوو

به فەرمایشتی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر): (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق:١).

دەستپێکردنی ڕاست و دروستیش ــ زۆربەی کات ــ کۆتاییەکی ڕاست و دروست مسۆگەر دەکات، جا بۆیە ئیسلام توانی بە فەزڵی قورئان و ئیمانەوە ئەو یەکەیە، یان ئەو بەندە بدۆزێتەوە کە هەموو یەکەکانی دیکە پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەویش بریتییە لە ناسینی خودای پاك و بێهاوتا، هەر بەوەش خودا ستایشی بەندە ئیماندارەکانی خۆی کردووە کە دەفەرموێت: (وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) (آل عمران: ١٩١).

واتە: (..وە بیر دەکەنەوە لە دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی (لە ئەنجامی ئەو بیرکردنەوەیەشدا دەگەنە ئەو ڕاستیەی کە بڵێن): ئەی پەروەردگارمان ئەمەت بێهوودە دروست نەکردووە، (واتە: بوونەوەرت بێ مەبەست و بێ ئامانج دروست نەکردووە و لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکەی لەسەر ئەو کارانەی کە لە ژیانی دونیادا دەیکەن، بۆیە دەڵێن):پاکی و بێگەردی بۆ تۆ لەوەی شتی پووچەڵ و بێهوودە دروست بکەی، جا بە لوتف و مەرحەمەتی خۆت لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە).

هەروەها یەکەکانی گەردوونیش ــ دیاردەو ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی ــ وا دەردەکەوتن کە تێکگیراو و دژ بە یەکبن، مرۆڤیان دەخستە دوودڵی و سەرسامییەوە، ڕەنگە هەندێکجار سەری کێشابێت بۆ بێباوەڕی و ئیلحاد و تانەدان و ناڕەزایەتی بەرامبەر وەدیهێنەر و هەڵسوڕێنەری جیهان، بەڵام زانستی ئیسلامی دامەزراو و راوەستا و لەسەر ئیمان و قورئان ڕێنمایی

مرۆڤی کرد بۆ ئەو یەکەیەی کە هەموو ئەم یەکە گەردوونییانە پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئەویش بریتییە لە ویستی زاڵی خودا (إرادة الله الغلّابة) و دانایيە سەرسوورِهێنەرەکەی.

زانایەکی گەورەی خۆرئاوایی کە (هیرالَد هوفدنج)ـە ئاماژەی کردووە بۆ گرنگێتی دۆزینەوە و دەستخستنی ئەم یەکەیە و ڕۆڵی چالاکانەی لە ژیانی مرۆڤـ و کاروانی زانست و ڕەوشتدا.

ئەو دەڵێت: (بەڕاستی بیرۆکەی هەموو ئاینێك (ئاسمانی لە بنەڕەتدا)[1] لەسەر یەکتاپەرستی، یان یەکخستن ڕاوەستاوە، ئەو بیرۆکەیە لەسەر ئەوە ڕادەوەستێت کە هۆکاری بوون (علە الوجود)ی هەموو ئەوانەی کە لە بوونەوەردان یەك دانەیەکە، ـ بەچاوپۆشی لەو گرفتانەی کە بەهۆی ئەم بیرۆکەوەیەوە بەشێوەیەکی پێکبەستراو (لازم) ڕوودەدەن ـ ئەو باوەڕە کاریگەرییەکی بەکەڵك و گرنگ لەسەر سروشتی مرۆڤ بەجێدەهێڵێت، ئەویش ئەوەیە کە شوێن کەوتووانی ئەم ئایینە بۆیان ئاسانە باوەڕبهێنن بەوەی کە هەرچی شت لە جیهاندا هەیە پێکەوە بەندن بە گوێرەی تەنها یاسایەك، بە چاوپۆشی لەهەر را جیایی و درێژەیەکدا.

جا پێویست دەکات بەهۆی ئەوەوە کە هۆکارەکە یەکێکە، یاساکەش هەر یەك یاسا بێت، فەلسەفەی چاخەکانی ناوەڕاستی ئایینی[1] بیرۆکەی ئەم یەکبوونەی لە ناو زۆری و زەوەندیی شتە دیار و بینراوەکانی جیهاندا لەهزری خەڵکدا چاند، ئەو بیرۆکەیەی کە مرۆڤی ناڕۆشنبیر لێی بێئاگا بوو

---

[1] ئەو زیادەیەی نێو کەوانەکە من بۆم زیاد کردووە تا وەکو مانای دەستەواژەکە دروست بێت، ئەگەر نا بەبێ ئەو دەستەواژەیە، بەو ڕەهاییە، جێگەی سەرنج و تێبینییە، چونکە بنەمای ئایینە مرۆڤکردەکان یەکتاپەرستی نییە. (طاهر).

[1] پێدەچێت چاخەکانی ناوەڕاستی ئاینی جیاواز بێت لە چاخەکانی ناوەڕاست، کە لە مێژووی ئەوروپادا بە سەردەمەکانی تاریکی هەژمار دەکرێت. (طاهر).

بەهۆی کاریگەریی زۆر و زەوەندیی لە دیاردەو دیمەنە سرووشتیەکاندا کە تیایدا ڕۆدەچوو و وێڵ و سەرگەردان دەبوو و، پەتکی یەکبوونی لەدەست دەردەچوو کە هەموو ئەم زۆر و زەوەندییەی پێکەوە دەبەست)[٢].

جا بەو هۆیەوە زانست وای لێهات کە ئامانجدار و بەسوود و گەیەنەر بێت بۆ لای خودا و هەوڵەکانی چڕ بکاتەوە لەسەر ئەو شتانەی کە سوود بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت و کۆمەڵگاو مەدەنییەت ئاسوودە بکات.

پێکەوە گرێدانی ئایین و زانست گەورەترین مننەت و چاکەیە بەسەر فیکر و کۆششی مرۆڤایەتییەوە و ئایندەی مرۆڤایەتی و ڕێڕەوی فیکری مرۆیی گۆڕی.

زانایانی خۆرئاوایی دانیان ناوە بە فەزڵی قورئاندا بەسەر زانستەکان و فیکری ئینسانیەوە، لێرەدا دوو شایەتییان بەنموونە دەهێنینەوە.

مارگۆ لیوپ (G. Margoliouth) کە بەوە ناسراوە بەرامبەر ئیسلام کینە لە دڵ بێت – سەرەڕای ئەوەش – لە پێشەکی ژیاننامەی (رادوێڵ J.N.Rodwell =) دا دەڵێت: (یەکێك لەو شتانەی کە گوتەی لێکۆڵەران لەسەری یەکە ئەوەیە: کە قورئان جێگە و پایەیەکی نایابی لە نێو کتێبە ئایینیە گەورەکاندا هەیە، هەر چەندە لەناو ئەم کتێبانەدا کە مێژوویان دروست کردووە کەم تەمەنترە[٣]، بەڵام پێش هەموویان دەکەوێت لە کاریگەری سەر سووڕهێنەردا لەسەر مرۆڤ، ئەو (قورئان) فیکرێکی ئینسانیی نوێی هێنایە ئاراوە و بناغەی قوتابخانەیەکی ئەخلاقی تایبەتمەندی دامەزراند)[٤].

---

[٢] History of modern Philosophy, P. ٥.

[٣] واتە دوای هەموویان دابەزیووە.

[٤] Rew. G. Margoliouth in Introduction toThe Qoran By Rev. J. M. Rodwell. London. ١٩١٨.

هەروەها (Hart Wighirschfeld) دەڵێت: (پێویست بە سەرسامی ناکات، ئەگەر بگوترێت: قورئان کانگا (سەرچاوەی) زانستەکانە، هەموو ئەو شتانەی قورئان لە بارەیەوە دواوە، لەزەوی و ژیان و مرۆڤایەتی و بازرگانیی و پیشەوە، جێگەی لێکۆڵینەوەی زانایان و ڕاڤەکاران (المفسرین) بووە. لە کتێبەکانیاندا لە میانەی ڕاڤەکردنیاندا بۆ قورئان تیشکیان خستۆتە سەری، ئەوەش بوارێکی فراوانی بۆ لێکۆڵینەوە و تێڕامان تیایاندا ڕەخساند، لە ڕێگەی ئەمەشەوە ڕێگا خۆش بوو بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتنی زانستەکان لەناو مسوڵمانانیدا، کاریگەری ئەم گەشەسەندن و پێشکەوتنە تەنها لە عەرەبدا کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو هانی فەیلەسوفەکانی جوولەکەی دا شوێنپێی عەرەب هەڵبگرن لە بابەتە دینییەکانی ئەو دیوی سروشتدا (ماوراء الطبیعة = میتافیزیکی)، پێویست بەباسکردنیش ناکات کە چەندە زانستی کەلام (علم الکلام)ی مەسیحی لە بابەتەکانی ئیلاهیاتدا سوودی لە لێکۆڵینەوەکانی عەرەب وەرگرتووە) (١) .

---

(١) Hartwing Hirschfeld: New Researches in to Compostion and Exegesis of The Quran – London – ١٩٠٢, P. ٩. لە زانستێکە :ئیلاهیات ..... خودا و ئەو شتانەی پەیوەندی بەوەوە هەیە، دەکۆڵێتەوە. بڕوانە: منجد الطلاب ماددەی (ألە): ل١٢. (طاهر).

## هەشتەم

## بەکارهێنانی زانست و عەقڵ و سوودمەندبوون لێی تەنانەت لە بابەتە ئایینییەکانیشدا هاندان لەسەر سەرنجدان و تێڕامان لە خودی مرۆڤ و دەوروبەری.

هیچ ئایینێك لە ئایینەکان و هیچ کتێبێك لە کتێبە ئاسمانییەکان ناناسین کە وەك قورئان بانگی کردبێت.[1]

١- بۆ بەکارهێنانی عەقڵ و سوودمەندبوون لێی بۆ بیرکردنەوە و گەیشتن بە ئەنجام.

٢- بۆ بەستنەوەی ڕووداوەکان بەهۆکارەکانەوە و دەرئەنجامەکان بە پێشەکییەکانەوە.

٣- بۆ پەندوەرگرتن و ڕێگرتن (لە شتە خراپەکان).

پاشان لۆمە و سەرزەنشتی کردبێت لەسەر:

١- پەکخستنی ئەوەی کە خودا بەمرۆڤی بەخشیووە لە شایستەیی وردبوونەوە و تێڕامان لەو شتانەی کە لە دەوروبەریدایە.

٢- پشتکردن لە بەڵگە و نیشانەکانی خودا لە خودی مرۆڤ و دەوروبەریدا.

٣- پشتکردن لە بەسەرهاتی وڵاتان و گەلان و سزا و تۆڵەی خودا لە ژیانی ئوممەتانی پێشوودا.

٤- پشتکردن لەو دەرئەنجامانەی کە لە کارو کردەوە و ڕەوشتەکانەوە (لەسەر ئاستی تاك و نەتەوە و حکومەت و گەلاندا) دەرکەوتووە.

قورئان هانی مرۆڤی داوە لەسەر بەکارهێنانی هەستەوەرە دیارەکانی، کە چاو لە گرنگترینیانە و هانی داوە لەسەر سوودوەرگرتن لەو هەستەوەرە بۆ بینینی دروست، تاوەکو لە بینینەوە سەر بکێشێت بۆ بەرچاوڕوونی (البصیرة)، ئەمەش لە هەنگاوە یەکەمینەکان دەژمێردرێت. وەك

[1] ئەم خاڵبەندییە لە بەر جوانتر ڕوونکردنەوە زیادم کردووە. (طاهر)

دەفەرموێت: **(أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاء إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ)** (السجدة: ٢٧).

واتە: (ئەوە نەیانبینیوە ئێمە ئاو بەردەدەینەوە سەر زەوی و زاری وشك و برینگ، جا بەهۆی ئەو ئاوەوە کشتوکاڵ دەردەهێنین، خۆیان و ئاژەڵەکانیان لێی دەخۆن، مەگەر نابینن؟).

قورئان لۆمەی پەکخستنی ئەم هێزە مەزنەی کردووە (هێزی بینین) کە هۆکاری ڕێگا دۆزینەوە و بەرچاوڕوونییە، بۆیە فەرموویەتی: **(فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ اللّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ)** (المائدة: ٧١).

واتە: (ئەو بێباوەڕانەی بەنی ئیسرائیل وایان گومان دەبرد کە تووشی سزا و تۆڵە لێسەندنەوە نابن بەهۆی کوفر و خراپەکارییەکانیانەوە، جا بۆیە کوێر و کەڕبوون لە ئاستی حەق و بەڵگەو نیشانەکانی خوادا، پاشان خودا تۆبەی لێوەرگرتن دوای ئەوەی کە تۆبەیان کرد، پاشان زۆرێك لەوانە بەردەوام نەبوون لە سەر تۆبەکارییەکەیان و کوێر و کەڕ بوونەوە (چاو و گوێچکەیان بەکارنەدەهێنا لە بینین و بیستنی حەق و ڕاستی و بینین و بیستنی ئایەتەکانی خودا، چ ئایاتی کەونی، یان ئایاتی قەولی)، خودا بینایە بەوەی کە ئەوان دەیکەن).

هەروەها دەفەرموێت: **(قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ)** (الأنعام: ٥٠).

واتە: (بڵێ: ئایا کوێر و بینا وەك یەك وان ؟ دەی ئایا بیرناکەنەوە ؟).

هەروەها دەفەرموێت: (مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالأَعْمَى وَالأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ) (هود: ٢٤).

واتە: (وێنەی ئەو دوو دەستەیە (بێباوەڕ و باوەڕدار) وەکو کوێر و کەڕ، وەك بیناو بیسەر وایە، ئایا بۆ نموونە ئەوانە وەك یەکن؟! مەگەر بیر ناکەنەوە؟).

دەفەرموێت: (قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ) (الرعد: ١٦).

واتە: (بڵێ: ئایا کوێر و بینا وەك یەك وان، یاخود ئایا تاریکییەکان و ڕووناکی وەك یەکوان ؟!).

دەفەرموێت: (وَمَا يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ، وَلاَ الظُّلُمَاتُ وَلاَ النُّورُ) (فاطر: ١٩ – ٢٠). واتە: (کوێر و بینا وەك یەك نین و تاریکییەکان و ڕووناکیش هەر وەك یەك نین).

هەروەها لەوپەڕی تووڕبوون و نەهیدا دەفەرموێت: (وَكَأَيِّن مِّن آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ) (يوسف: ١٠٥).

واتە: (...وە زۆر لە بەڵگەو نیشانە هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا ئەوان بەلایاندا تێدەپەڕن، بەڵام پشتی تێدەکەن).

غیرەت لە لای خاوەن دیدەکان دەوروژێنێت و دەفەرموێت: (فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الأَبْصَارِ) (الحشر:٢).

(جا پەندو ئامۆژگاری وەربگرن ئەی خاوەن دیدەکان ـ بیرۆهۆشەکان ـ).

ئەگەر بێینە سەر هاندانی قورئان لەسەر بەکارهێنانی عەقڵ و ژیریی و وروژاندنی غیرەت لەلای خاوەن عەقڵەکان، ئەوا دەبینین لە قورئاندا وشەی (تعقلون) ئەوەندە دووبارە بۆتەوە تاگەیشتۆتە (٢٣) جار لە (٢٣) ئایەتدا. بەم شێوازانە هاتووە: (لعلكم تعلقون) (أفلا تعقلون) (إن كنتم تعقلون)، هەر

بۆ نموونە چەند ئایەتێك باس دەكەین: (كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (البقرة: ٢٤٢).

واتە: (ئا بەو شێوەیە خودا بەڵگە و نیشانەكانی بۆ ئێوە ڕووندەكاتەوە بەشكم تێبگەن و ژیر بن).

(قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ) (آل عمران: ١١٨).

واتە: (بێگومان بەڵگە و نیشانەكانی خۆمانمان بۆتان ڕوونكردۆتەوە، ئەگەر ئێوە ژیر بن و لێی تێبگەن و وەریبگرن).

(وَالدَّارُ الآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (الأعراف: ١٦٩).

واتە: (..وە خانە وماڵی دواڕۆژ چاكترە بۆ ئەوانەی لە خوا دەترسن و پارێز دەكەن، ئایا ژیر نابن؟).

(لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (الأنبياء: ١٠).

واتە: (سوێند بێت بۆ ئێوەمان ناردۆتەوە خوارەوە پەرتوكێك كە ناوبانگ و بڵندی ئێوەی تێدایە، ئایا بیرناكەنەوە و ژیر نابن؟).

(وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ، وَبِاللَّيْلِ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (الصافات: ١٣٧).

واتە: (وە ئێوە (قوڕەیشییەكان)، بەلایاندا تێدەپەڕن (پاشماوەی قەومی لوط) لە بەیانیاندا، وە بەشەویش ئایا ژیر نابن؟).

قورئانی پیرۆز وەسفی ئەهلی دۆزەخ دەكات بەوەی سوودیان لەم هەستە وەرنەگرتووە:

(وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ) (الملك: ١٠).

واتە: ( دۆزەخییەكان وتیان: ئەگەر بمانبیستایە (بانگی حەق) و تێیبگەیشتینایە (وەرمانبگرتایە) ئەوا ئێستا لە هاوەڵانی ئاگری هەڵایسا و (دۆزەخ) نەدەبووین).

هەروەها وشەی (يعقلون) لە قورئاندا، لە مەقامی مەدح و پێداهەڵدان و لە مەقامی ئیسپات و سەلماندندا، لە زیاتر لە ٢٠ شوێندا هاتووە.

هەر چۆن قورئان بایەخی بە عەقڵ و ژیریی داوە، هەر بە هەمان شێوەش بانگی کردووە بۆ بیرکردنەوە و ستایشی ئەو کەسانەی کردووە کە بیر دەکەنەوە و لۆمە و سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە بیر ناکەنەوە، ئەم وشەیەش (يتفكرون) لە قورئاندا ١١ جار هاتووە.

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ) (آل عمران: ١٩١).

واتە: ( ئەوانەی کە بە دانیشتن و ڕاوەستاویی و ڕاکشاویی و لەسەر لا یادی خودا دەکەن، وەبیر لە دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە.....).

(فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) (الأعراف: ١٧٦).

واتە: (چیرۆك و بەسەرهاتەکانیان بۆ بگێڕەوە، بەشکم بیربکەنەوە و پەندی لێوەرگرن).

(إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الرعد: ٣).

واتە: (دوای ئەوەی خوای پەروەردگار باسی دروستکردنی ئاسمان و خۆر و مانگ و زەوی و چیاکان و ڕووبار و بەروبووم و میوە و شەو و ڕۆژ دەکات، دەفەرموێت: بەڕاستی ئا لەوانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ ئەو کەسانەی بیردەکەنەوە).

دەرئەنجامی ئەو هاندان و بایەخدانە بە بیرکردنەوە سەرەڕای زیاتر پەیبردن بە حەقیقەتی گەورە، ئەو حەقیقەتەی کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووە، دەربارەی ئەو کەسانە دەدوێت کە ژیریی و بیرکردنەوەیان بە

ڕێگەیەکی دروست بەکاردەهێنن: (رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً). واتە: (ئەی پەروەردگارا ئەم بوونەوەرەت بەبێ هودە دروست نەکردووە).

بەڵێ، سەرەنجامی ئەو هاندان و بایەخدان بە بیرکردنەوە و بەکارهێنانی عەقڵ و هەستەوەرەکان، ئەو چالاکییە فیکرییە جیهانییە بوو کە لە هەموو بوارێك لە بوارەکانی زانست و پیشەسازی و مەدەنیەتدا ڕەنگیدایەوە، کاریگەریی و شوێنەواری بەسەر هەموو جیهانەوە دەرکەوت، هەروەك ئەوە وابوو دەلاقە و دەرچەیەك بە ڕووی جیهاندا کرابێتەوە هەوای ئازاد و ڕووناکی لێ چووبێتە ژوورەوە، یان وەك ئەوە وابوو ئەو کڵۆم (قوفڵ) ـە شکێنرابێت، یان کرابێتەوە کە دوژمنانی ئازادیی و بیرکردنەوەی ڕاست و دروست، یان نوێنەرانی ساختەی ئایینە دێرینەکان لە عەقڵی مرۆڤایەتییان دابوو.

جیهان لەو مت بوون و سڕبوونە قووڵەی کە چەندین سەدە و هەزاران ساڵ درێژەی کێشا بە ئاگاهات و دەستی کرد بەسڕینەوەی شوێنەواری ئەو خەوە قوڵە لەسەر چاوەکانی و بە هەنگاوی خێرا بەرەوپێش دەچوو بۆ پێڕاگەیشتن و قەرەبووکردنەوەی ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنەی لە دەستی چوو بوو، بۆ لابردنی کۆسپ و تەگەرەکانی سەر ڕێگای کاروانی دوور و درێژی ژیان.

زانایەکی گەورەی فەرەنسی جۆلیڤە کاستیلۆ (Jolivet Castelot) لە کتێبەکەیدا (قانون التأريخ = یاسای مێژوو = Laloi De L, Histoire) دەربارەی ئەم کاریگەرییە جیهانییە و ئەم هەژانە بەهێز و لەهەمانکاتدا نەرم و نیانە دەدوێت و دەڵێت: (پێشکەوتنی عەرەبی لە دوای وەفاتی پێغەمبەر پێشکەوتنێکی مەزن بوو، زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت، زەمان لە بار بوو بۆ بڵابوونەوەی ئیسلام، بۆیە مەدەنییەتی ئیسلامیی بە سەرهەڵدانێکی سەرسووڕهێنەر سەریهەڵدا، لە هەموو شوێنێك بە زیرەکییەکی سەیر لەگەڵ

فتوحاتدا بەرپا بوو، کاریگەرییەکەی لە هونەر و وێژە و شیعر و زانستەکاندا دەرکەوت، بە درێژایی چەندین سەدە عەرەبەکان مەشخەڵی ڕووناکی عەقڵییان بەدەستەوە گرتبوو، هەموو زانستە مرۆییەکانیان بەرجەستە کردبوو کە پەیوەندییان بە فەلسەفە و فەلەك و کیمیا و پزیشکی و زانستە ڕۆحیەکانەوە هەبوو، بوونە سەردارانی فیکر و داهێنان — نەك بەمانا باوەکەی — بەڵکو بەهۆی دەستخستنی ئەسالیبەکانی زانستەوە بوو، کە بەوپەڕی کارامەییەوە بەکاریانهێنا، مەدەنیەت و شارستانییەتی عەرەب تەمەنی کورت بوو، بەڵام کاریگەرییەکی سەرسووڕهێنەری هەبوو، هیچمان لەدەست نایە بۆ لاوازبوونی جگە لە دەربڕینی ئەسەف و ئەفسوس).

هەروەها نووسەر زیاتر دەچێتە پێش و دەڵێت: (ئەگەر چی گەورە و کاربەدەستانی وڵات خاوەنی خۆویستی بوون، بەڵام ئەو کارەی کە لەدەور و پشتیان ڕوویدا لە خۆیان بەرز و بڵندتر بوو، لەوەوە شارستانییەتێکی سەرسوڕهێن بەرپابوو، بەڕاستی ئەورووپا قەرزاری شارستانییەتی عەرەبییە بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی کە بۆی نووسرا لەسەدەی دەیەمەوە هەتا سەدەی چواردەیەم، ئەورووپا لەوانەوە بیرۆکەی فەلسەفەی زانستی وەرگرت کە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بە ناویدا تەشەنەی کرد، تەشەنەکردنێکی سست و کەموکورت، ئەورووپای ئەو ڕۆژگارەمان بەنزمی و نەزانیی دێتەپێشچاو لەبەردەم مەدەنییەتی عەرەبیدا، لەبەردەم زانستی عەرەبی و ئاداب و هونەری عەرەبیدا، ئەورووپا قەرزاری ئەو کەشوهەوا بەسوودەی فیکرەکانی عەرەبە کە لەو سەردەمانەدا لێی سوودمەند بوو، چوار سەدەی ڕەبەق بەسەرچوو، ئەورووپا هیچ شارستانییەتێکی تێدا نەبوو، جگە لە

شارستانییەتی عەرەبی، زاناکانی ئەوروپاش هەمان ئەو زانایانە بوون کە هەڵگری ئاڵای شەکاوەی ئەو شارستانییەتە بوون)[١] .

هەرەوەها گۆستاڤ لۆبۆن (Gustave Lebon) دەڵێت: (خەڵکی ڕێسای ئەزموون و تێبینیکردن (التجربة والملاحظة)، و مەنتیقی ئیستیقرائی[٢] (Inductive Logic) دەدەنە پاڵ باکۆن (Francis Bacon)، کە هەر ئەم دوو شتەش بنچینەن بۆ بناغەی توێژینەوەی زانستیی نوێ، بەڵام بێگومان ئەمڕۆ پێویستە دان بەوەدا بهێنرێت کە ئەم ڕێگایانە هەمووی لە داهێنانەکانی عەرەبە).

ڕۆبەرت بریفۆڵت (Robert Briffault) لە کتێبەکەیدا ( The Making Humanity) دا دەڵێت: (هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی پێشکەوتنی ئەورووپا نییە، ئیللا شارستانیەتی ئیسلامی تیایدا فەزڵی گەورەی هەیە و شوێنەواری یەکلاکەرەوە و کاریگەریی گەورەی هەیە)[٣] .

هەروەها دەڵێت: (بە تەنها زانستە سروشتییەکان (کە فەزڵیان بۆ عەرەب دەگەڕێتەوە) نەبوون کە ئەوروپایان گێڕایەوە بۆ ژیان، بەڵکو شارستانییەتی ئیسلامی بوو هەر لەو کاتەوە، کە یەکەم تیشکی ڕەوانەی ئەوروپا کرد، کاریگەرییەکی زۆر و جۆراوجۆری کردە سەر ئەوروپا)[٤] .

---

[١] الإسلام والحضارة العربية. للأستاذ محمد كرد علي ٢ / ٥٤٣ – ٥٤٤.

[٢] ئیستیقراء: گەڕان و پشکنینە بە دوای جوزئیاتەکاندا بۆ گەیشتن بە یاسا گشتییەکان. بڕوانە (المعجم الوسيط: ٧٢٢). (طاهر).

[٣] الإسلام والحضارة العربية. ٢ / ٢٠٢.

[٤] The Making of Humanity P. ٢٠٢ -

# نۆیەم

## بوونی ئوممەتێك هەڵبسێت بە بەرپرسیارێتی سەرپەرشتیاریی بە سەر جیهانەوە و چاودێریی بەسەر ڕەوشت و ئاکاری تاکەکان و ئوممەتانەوە

یەکێك لەو شتانەی کە مێژووی دوور و درێژی مرۆڤایەتی و دەروونزانی و ڕەوشتزانی شایەتییان لەسەر داوە، ئەوەیە کە مەبەستە بەرزەکان‌و ڕێنماییە چاکەکان و نموونە کردارییە بڵندەکان بەرپا نابن و نایەنەدی ـ ئەگەر بەرپاش بن بەردەوام نابن ـ ئەگەر کۆمەڵێك کەس، یان ڕاستتر بڵێین: ئەگەر کۆمەڵێك لە خەڵك لەپشتی نەبن، کە بانگەوازەکە هەڵگرن و ئاڵاکەی بەرزبکەنەوە و لە پێناویدا جیهاد (خەبات) بکەن و بە کرداریی نوێنەرایەتی بکەن.

هەر بۆیە دەبینین: ڕێنماییەکانی هەندێك لە پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێت)، چاکەخوازان و فێرکارانی ئەخلاق و مامۆستایانی گەورەی دانایی، ماوەیەکی درێژ بەردەوام نەبوونە، لەبەر نەبوونی ئومەتێك (کۆمەڵێك) کە پەیامەکەیان هەڵبگرێت و خۆیانی لە پێناودا بەخت بکەن و لە ژیانیاندا بە مەدەنیەت و حکومەت و کۆمەڵگەکەی، بینوێنن و جێبەجێی بکەن.

جا بۆیە ژیان لەو ناوچانەی کە ئەو پێغەمبەرانەی تێدا ڕەوانە کرابوو، وەکو ئاوێکی سەرڕێژ وابوو کە یەك نمرە بەرز بووبووەوە، گەل و نەتەوەکانیش (کە ئەو پەیامەیان بە زیندووی تێدا نەما) وەك ڕانەمەڕێکی بێ شوانیان لێهات، بەڵام کاتێك خودا فەرمانی دا بەوەی کە محەممەد (دروودی خوای لەسەر) ببێت بە پەیامبەری کۆتایی و هیچ پێغەمبەرێکیش دوای ئەو ڕەوانە نەکرێت و هیچ کتێبێکیش لە ئاسمانەوە دانەبەزێت، مرۆڤی پاراست لەم مەترسییە، لەگەڵ محەممەد (دروودی خوای لەسەر)دا ئوممەتێکیشی ڕەوانە کرد، جا بۆیە ڕەوانەکردنی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) ڕەوانەکردنێکی پەیوەنددار بوو، ڕەوانەکردنی پێغەمبەرێك بوو

پەیوەست بە ڕەوانەکردنی ئوممەتێك، جا بۆیە خوای پاك و بێگەرد وەسفی ئوممەتی پێغەمبەر دەکات بە سیفەتگەلێك کە تەنها بەسەر ڕەوانەکراوێکدا دەبڕێت، کە لە خواوە فەرمانی پێکرابێت، وەك دەفەرموێت:

(كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (آل عمران: ١١٠).

واتە: (ئێوە باشترین ئوممەتێك بوون کە بۆ خەڵکی هێنرانە کایەوە، فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەن).

دەفەرموێت: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) (البقرة: ١٤٣).

واتە: (ئا بەو شێوەیە کردمانن بە ئومەتێکی میانڕەوی هەڵبژاردە تاوەکو ببنە چاودێر بەسەر خەڵکەوە و پێغەمبەریش ببێتە چاودێر بەسەر ئێوەوە).

لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا (دروودی خوای لەسەر) هەمان گوزارشت هاتووە، کاتێك بە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) فەرموو: ( إنما بُعِثتُم میسِّرین ولم تُبْعَثوا معسِّرین) [(١)] .

واتە: (ئێوە ڕەوانەکراون ئاسانکار بن، ڕەوانەنەکراون زەحمەتکار بن).

ئەم هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی ڕەوانەکراویی و بەرپرسیارێتی فەرمانپێکراویی، ناخی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) و شوێنەکەوتووانیانی بەچاکی پڕکردبوو، بۆیە کاتێك ڕۆستەم، سەرکردەی فارسەکان، پرسیاری لە (ڕەبیعی کوڕی عامیر) [(٢)] کرد، کە فەرماندەی گشتیی سوپای مسوڵمانان، گەورەمان (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) (خوا

---

[(١)] ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

[(٢)] هاوەڵێکە بە نوێنەر چووبووە لای ڕۆستەم. بڕوانە: الإصابە ٥٠٣/١.

لێی ڕازی بێت) لەسەر داوای ڕۆستەم ڕەوانەی لای ئەوی کردبوو، ڕۆستەم پرسیاری لێکرد: چی ئێوەی هێناوەتە ئێرە؟ وەڵامی دایەوە و گوتی: (خودا ئێمەی ڕەوانە کردووە، تاوەکو ئەوانەی کە خودا ویستی لەسەریەتی دەریانبێنین لە بەندایەتی بەندەکانەوە بۆ بەندایەتی خودا بەتاك و تەنهایی و لە تەنگیی دونیاوە بۆ بەرفراوانیێکەی و لە ستەم و جەوری ئایینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام) [٣] .

ئەوە ئەو شتەیە کە کاری کردە سەر ئایندە و داهاتووی مرۆڤایەتی، ئەوە بۆ خەڵکی ئەزموونێکی نوێ بوو لە مێژووی ئایینەکان و مێژووی چارەنووسی گەلان و مێژووی ئاڕاستەکاندا، وەرچەرخانی لە مێژوودا دروستکرد، چونکە واقعی مرۆڤایەتی کە لە سەدەی شەشەمی مەسیحیدا تێیدا دەژیا ـ هەموو سەردەمێکیش هەروایە ـ لەوە فراوانتر و گەورەتر بوو کە تەنها چەند کەسێکی چاك بتوانن کاری تێبکەن.

قورئانیش شایەتی هەبوونی چەند کەسێکی باشی کەم لەناو جوولەکەی غەزەب لێگیراودا دەدات و دەفەرموێت:

(لَيْسُواْ سَوَاء مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ، يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُوْلَـئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ) (آل عمران:١١٣ – ١١٤).

واتە: (هەموو خاوەن پەڕتووکە ئاسمانییەکان وەك یەك نین، لەناو خاوەن پەرتووکەکاندا کۆمەڵێکی ڕاست و ڕێك هەن ئایەتەکانی خودا لە کاتەکانی شەودا لە حاڵێکدا کە لە شەو نوێژدان، دەخوێننەوە، باوەڕ دەهێنن بە خودا و ڕۆژی دوایی و فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگە لە خراپە

---

[٣] بڕوانە: ((البداية والنهاية )) ٧ / ٣٩.

دەگرن و پەلە دەکەن و پێشبڕکێ دەکەن لە کاری خێردا، ئا ئەوانە لە چاکەکارانن).

لەگەڵ ئەوەشدا، کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە کۆمەڵگەی ئینسانی و کاروانی مرۆڤایەتیدا نەبوو، چونکە چەند کەسێك بوون، گەلانیش ئەوەندە حیساب بۆ چەند کەسێکی کەم ناکەن، لە هەموو کات و شوێنێکدا کەسانێکی باش و چاك هەبوون و ئێستاش هەن کە جیاوازن لەخەڵکی دیکە لە هەندێك رەفتار و ئەخلاق و خواپەرستییاندا، بەڵام ئەو بۆشایی و قەیرانەی لەسەر ئاستی نەتەوە و گەلان و لەسەر ئاستی مەدەنییەت و کۆمەڵدا هەیە پڕنابێتەوە، مەگەر ئەو باشی و سەرمەشقییە چاکە و نموونە کردارییانە لەسەر ئاستی ئوممەت و گەلدا بن، لەسەر ئاستی کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتیدا بن کە نوێنەرایەتی ڕێنماییە بەرزەکانی پێغەمبەرایەتی بکات و نوێنەرایەتی پرەنسیپ و ڕەوشتی بەرز و ئاکاری تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی نموونەیی بکات، ئەمانەش لەسەر ئاستی حکومەت، سیاسەت، بازرگانی و مامەڵە، ژیانی ناوماڵ، کۆمەڵایەتی، مامەڵە لەگەڵ تاکو کۆمەڵگە، گەلان، دەوڵەتانی دیکەدا، لە حاڵەتی ڕەزامەندیو تووڕەیی، لەکاتی رێکەوتن و ئاشتی و مەیدانی جەنگ، لە هەژاریی و خۆشگوزەرانیدا، مۆرکی گشتی بن بۆ کۆمەڵ و گەلو سیمای دیار و دەرکەوتوویان بن.

هاوەڵان (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) بەو شێوەیە بوون، ئەو هاوەڵانەی لە ئامێزی پێغەمبەرایەتیدا پێگەیشتن و لە قوتابخانەی ئیمان و قورئانەوە دەرچوون.

یەکێك لە زانا بەویژدانەکانی خۆرئاوا کە ئاگای لە مێژووی گەلان و شارستانییەتەکان هەیە بە چاکی وێنەی ئەو نەوەیەی کێشاوە، کە ڕوێنراوی

پێغەمبەرایەتی و چێنراوی قورئان بوون، زۆر بە چاکی ئاماژەی بۆ سیمای دیار و هاوبەشیان کردووە.

زانای ئەڵمانی کاتانی (Caetani) لە کتێبەکەیدا (سنين الإسلام)دا دەڵێت: (بەڕاستی ئەو هاوەڵە (بەڕێزانە) نوێنەری ڕاستەقینەی کەلەپووری ڕەوشتی پێغەمبەری خودا بوون و بانگەوازکارانی ئایندە و هەڵگرانی ڕێنماییەکانی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) بوون، کە گەیاندبووی بە ویستیارانی پارێزکاری و لە خــوداترسی.

پەیوەندی بەردەوامیان بە پێغەمبەری خوداوە و (دروودی خوای لەسەر) خۆشەویستی بێخەوشیان بۆ ئەو، بەرزی کردبوونەوە بۆ جیهانێك لە فیکر و سۆز، کە هیچ ناوەند و ژینگەیەك مەدەنییەت و کۆمەڵگایەکی لەوە بەرزتر و بڵندتری بەخۆوە نەدیبوو، لە واقیعدا ئەم هاوەڵانە لە هەموو لایەکەوە گۆڕانکاریی و وەرچەرخانی بەهاداری زۆر تیایاندا ڕوویدا، لەوەودوا لە زەحمەتترین و ناڕەحەتترین بۆنەی جەنگەکەکاندا سەلماندیان کە بنەماکانی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) لە بەپیتترین زەویدا تۆو کراون و زۆر بە چاکی ڕوواون، ئەویش لە ڕێگەی خەڵکانێکی خاوەن توانای زۆر بەرزەوە، ئەوان پارێزەر و ئەمینداری کتێبی پیرۆز بوون و زۆر بەچاکی پارێزگارییان لەوە دەکرد، کە لە پێغەمبەری خواوە وەریان گرتبوو لە گوفتار و لە فەرمان، ئەوانە سەرکردە پێشینە بەڕێزەکانی ئیسلام بوون، کە شەرعناسان و زانایان و فەرموودەناسە یەکەمەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامییان خستەوە) [١].

(١) Caetani (Annalidell Islam) vol. ii, P. ٤٢٩. T. W. Arnold, Preaching of Islam, London, ١٩٣٥.

ئەم ئوممەتە ئیسلامییە بەرپرسیارێتی سەرپەرشتیی سەر جیهان و چاودێری سەر ئەخلاق و ئاراستەکان و ڕەوشتی تاك و کۆمەڵی خراوەتە ئەستۆ، هەروەها بەرپرسیارێتی بەرپاکردنی دادپەروەریی و شایەتیدان بۆ خودا بەسەر خەڵکەوە و فەرمان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە و خۆدانان بەو ئوممەتەی کە ڕۆژی دوایی پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی ئەوە کە تا چەند هەستاوە بەو ئەرکە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر کەمتەرخەمی لەو ئەرکەدا و خۆخەریککردن بەخۆیەوە و نەپەرژانی بەسەر خەڵکانی دیکەدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) (المائدة: ٨ ).

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، زۆر بە چاکی بۆ خوا هەستن بەشایەتیدان بە دادپەروەری، با ڕق و کینەتان لە کۆمەڵێك هانتان نەدات لەسەر ئەوەی ڕاست نەڕۆن و دادگەر نەبن، دادگەر بن، ئەوە نزیکترە لە خواترسان و پارێزکارییەوە، لەخوا بترسن و پارێزکار بن، بێگومان خودا ئاگادارە بە کردەوەکانتان).

خوای گەورە هۆشداریش دەداتە ئوممەتی ئیسلامی لە کەمتەرخەمی کردن لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی کە لەسەریەتی، ئەو کەمتەرخەمییە چ بەڵاو نەهامەتیو بڵاوبوونەوەیەکی ئاشوب و خراپەکاری بەسەر مرۆڤایەتیدا دەهێنێت؟!، بە کۆمەڵەیەکی بچووك دەفەرموێت کە ژمارەی تاکەکانی لەچەند سەد کەسێك تێپەڕی نەدەکرد لە ژیانی یەکەمجاری مەدینەدا، کە

فەرمانی برایەتی و پێکهێنانی شانەی ئیسلامی پێکرابوو لەسەر بناغەی عەقیدە و بانگەواز:

﴿إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾. (الأنفال : ٧٣).

واتە: (ئەگەر وانەکەن (ئەگەر پشتیوانی و دۆستایەتی یەکتر نەکەن)، ئەوا ئاشوب و فیتنە و خراپەیەکی گەورە بە زەویدا بڵاودەبێتەوە).

ئوممەتی ئیسلامی کە ئێستا زەوی پڕ کردووە، خاوەنی دەوڵەتانێکی گەورە و وزە و تواناگەلێکی دەوڵەمەندی مرۆییە، چۆن دەبێت و چی بەسەردێت ئەگەر کەمتەرخەمی بکات، یان دەستبەرداری پێگەی سەرکردایەتی بانگەوازکارانەی بێت، یان کەمتەرخەمی لە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکەی بکات، کە بریتییە لە چاودێریی بەسەر ئەخلاق و مەیل و ئاڕاستەکانەوە، لەگەڵ سەرخستنی ستەملێکراو و ڕێگرتن لە ستەمکردنی ستەمکار؟!.

قورئانی پیرۆز ئەو پێگە سەرکردایەتییە بانگەوازکارییەو ئەو ئەرکە چاکسازییە و بەرپرسیارێتی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە وەبیر ئەم ئوممەتە دێنێتەوە و حەواڵەی لای ئوممەتانی لەناوچوو و بەسەرچووی ڕابردووی دەکات و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لا لە ئێستادا دەوروژێنێت [1].

---

[1] شاعیری ئیسلام، دکتۆر (محمد ئیقبال) بەباشیی ئەم ڕاستییەی لە شیعرێکیدا بە ناونیشانی: ((پەرلەمانی ئیبلیس)) ڕوونکردۆتەوە: لەسەر زمانی سەرۆکی پەرلەمان ((ئیبلیس)) باسی ئەو مەترسییە دەکات کە هەڕەشە لەسەر سیستمی ئیبلیسی دەکات بەبوونی مسوڵمان، ئەگەر وەئاگا هات و لەبەرانبەر جیهان و گەلاندا هەستی بە بەرپرسیارێتی کرد، وەك دەڵێت: ((گوێی مسوڵمان داخەن (قەپاتکەن)، چونکە ئەو دەتوانێ بە بانگدان و تەکبیرکردنەکەی تەلیسمی جیهان بشکێنێت و سیحرەکەمان پووچەڵ بکاتەوە، هەوڵبدەن

وەك دەفەرموێت: (فَلَوْلاَ كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الأَرْضِ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مَا أُتْرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجْرِمِينَ) (هود : ١١٦).

واتە: (دەی با ببوایە لەناو ئەو ئوممەتانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون کەسانی خاوەن ئایین و ژیری، ڕێگرییان بکردایە لە خراپەکاریی لە زەویدا، (ئەم کارەیان نەکرد) مەگەر کەسانێکی کەم لەوانەی ڕزگارمان کردن لەو گەلانەدا، ئەوانەش کە ستەمیان کرد، شوێنی ڕابواردن و خۆشی کەوتن، ئەو ستەمکارانە تاوانبار و خراپەکاربوون).

ئەمە وا پێویست دەکات کە کاریگەریی لەسەر شارستانییەتی مرۆڤایەتی هەبێت و ناوبەناو و سەرلەنوێ بیخاتەڕوو و چاودێریی بکات، تا بەردەوام ڕێگری بکات لە نێوان ئەم شارستانیەتە و ڕەگەزەکانی وێرانکردن و لەناوبردن و ئاڕاستە تێکدەر و ڕووخێنەرەکان.

---

شەوی مسوڵمان درێژە بکێشێت و سەحەر و بەرەبەیانی سست و هێواش بێت. سەرقاڵیکەن براکانم، تا نەپەرژێتە سەر کار و کۆشش، تا وەکو پێشبڕکێکە لە جیهاندا بدۆڕێنێت، بۆ ئێمە چاك وایە مسوڵمان بە یەخسیری و بەندەیی بمێنێتەوە، واز لەم جیهانە بهێنێت و خۆی کەنار بخات و دەستبەرداری بێت بۆ خەڵکی دیکە، بێنیاز و بێتەماع بێت لێی، خەتەر و مەترسی ئەم کارەشی بە کەم بزانێت، وای بۆ ئێمە! بەدبەختی و نەهامەتی بۆ ئێمە ! ئەگەر ئەم ئوممەتە، وەئاگا بێت کە دینەکەی جەختی لێدەکات چاودێریی و پاسەوانی جیهان بکات. (روائع إقبال، ص ١١٨، طبعة دار إبن كثير الأولى، ١٩٩٩م ).

له دواییدا، نەك دواهەمیندا، باسی ئەو یەكێتییە جیهانییە دەكەین كە مێژوو وێنەی وەهای بەخۆوە نەدیوە لە فراوانی و قووڵی و پتەوییدا لە دەورانی شارستانیەتی مرۆیی و كۆمەڵگە جۆراوجۆرەكانی مرۆڤایەتیدا.

ئەو یەكێتیە جیهانییە لە ڕابردوو و ئێستادا ڕاوەستاوە [١] :

یەكەم: لەسەر بناغەی یەكێتی عەقیدە، كە بریتییە لە عەقیدەی یەكتاپەرستی و ئیمان بە پێغەمبەرایەتی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) و ژیانی پاش مردن.

دووەم: لەسەر یەكێتی تێڕوانین بۆ دیاردە گەردوونییەكان و دەسەڵاتی خوداییو تەعلیل كردن (خستنە ڕووی هۆكارەكانی ئەو دیاردە گەردوونیانە).

سێیەم: نرخاندنی ماهییەت و بەهای شتەكان لەسەر بناغەی ئیمان بە خوداو ئامانجی خولڨاندن و وەدیهێنان (غاية الخلق والتكوين).

چوارەم: بڕوا بوون بەوەی ئەم ژیانە كاتی و سنووردارە.

پێنجەم: باوەڕبوون بەو بەها بەرزانەی كە ئیسلام بانگەوازی بۆ دەكات و پێشەنگێتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و ژیانی هاوەڵان و نەوەی نموونەیی یەكەم نواندوویەتی، ئەویش لەگەڵ جیاوازیو جۆراوجوری دەستگرتنیان بەو بەهایانەوە و ڕاساڵی و بەردەوامبوونیان لەسەری، جیاوازییەك كە فیترەتی ئینسانی و جیاوازیی ڕۆژگار و سەردەم و ژینگە و پەروەردە و كاریگەرییە دەرەكییەكان دەیخوازن، بەڵام ئەندازەی هاوبەش (القدر المشترك) لە نێوان كۆمەڵگا ئیسلامییەكاندا لە هەموو سەردەمانێكی دوای دەركەوتنی ئیسلام دیارترین شێوە و گەورەترین قەبارە و قووڵترین

---

[١] ئەم خاڵبەندییە من بۆم زیاد كردووە لەئەسڵدا بۆی نەكراوە. (طاهر).

ڕەگ و ڕیشاڵی هەیە، زیاتر لە هەر ئەندازەیەکی هاوبەشی نێوان بەشەکانی هەر ئوممەتێك و شوێنکەوتووانی هەر ئاینێك.

پاشان دامەزراندنی یەکێتی شارستانێتی لەسەر بناغەی ئەحکامە شەرعییەکان و ڕێنماییە ئەخلاقیەکان، بەڵام ئەمە لەگەڵ بوونی جیاوازی لە نێوان ئاستەکاندا و مەودای کارکردن بەم ئەحکام و ڕێنماییانە، جیاوازییەك کە ناتوانرێت دوورە پەرێزی لێبکرێت بەهۆی جیاوازی سروشتی ئەو گەلانەی هاتنە ناو ئیسلامەوە و سروشتی وڵاتان و سەردەم و سیستمەکانی حوکمڕانی.

لەگەڵ ئەوەشدا شارستانیەتێکە تایبەتمەندە بە مۆرکی ئیسلامی و شارستانییەتێکە لە عەقیدەدا دەناسرێتەوە بە یەکتاپەرستی و لە کۆمەڵایەتییدا بە ڕێزگرتنی مرۆڤایەتی و یەکسانی لە نێوان تاکەکانیدا، لە بازنەی ئەخلاقوپەیڕەودا بە تەقوای خودا ــ بە بەراوورد لەگەڵ شارستانییەتەکانی دیکە ــ و بە شەرم و تەوازوع، لە مەیدانی خەباتدا بە کۆشش بۆ دواڕۆژ و جیهاد لە پێناوی خودادا و لە ژیانی تاکەکەسی و ماڵەوەدا بە بایەخدان بە سەربڕین لە گۆشتی ئاژەڵان و پەلەوەراندا، بە بایەخدانی دیار و ئاشکراش بە (الطهارة) ـ کە ئەمیان تایبەتترە لە (النظافة)[1] کە هەموو شارستانیەتە پێشکەوتوو و کۆمەڵگا دروستەکان لەمەیاندا دەگەنە یەك ـ ناوی مسوڵمانان لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا وێڕای دوورییان لە یەکتر و جیاوازییان لە زمان و فەرهەنگیاندا هەمیشە جیایە و

---

[1] وشەی (الطهارة) لە زمانی عەرەبیدا بۆ پاکی و پاکژی لە شتی ماددی و مەعنەویدا بەکاردێت، بۆ نموونە دەگوترێت: (طاهر الخُلُقِ والثَّوب)، بەڵام وشەی (النظافة) تەنها بۆ شتی ماددیی و بەرجەستە بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە دەگوترێت: ( نظیف الثوب والجسد). بڕوانە: (الفروق اللغویة، أبو هلال العسكري: ٣٣٩). (طاهر).

تایبەتمەندە، زۆرێکی عەرەبییە و لە ناوی پێغەمبەران و هاوەڵان و ئەهلی بەیت و پیاوچاکانی پێشین وەرگیراوە، لەم ناوانەدا عەقیدەی یەکتاپەرستی ڕەنگدەداتەوە، یان چەمکی بەندایەتی و سوپاسگوزاری، ناونان بە محەممەد و ئەحمەد زۆر دەبینرێت، ئەویش لەبەر خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) و گەشبینی بە ناوە جوانەکەی.

## سیما دیارەکانی ئەم یەکێتییە

ئەم یەکێتییە ئایینی و شارستانییە لە یەکێتی فەرائیز واجباتەکان و ژمارەیەك دروشمی ئایینی و بۆنەگەلێکی کۆمەڵایەتی ڕەنگدەداتەوە.

پێنج نوێژە فەرزەکە لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدرێت ـ هەر وڵاتە و بەپێی کاتەکانی خۆی ـ نوێژەکان بە کۆمەڵ لە مزگەوتەکاندا دەکرێن و هەموو مسوڵمانێك، خەڵکی هەر وڵاتێك بێت، بە هەر زمانێك قسە بکات دەتوانێت ئامادەی ئەم نوێژانە بێت، یان ببێت بە ئیمام و پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات (ئەگەر نوێژخوێنەکان بیانەوێت) بێئەوەی پێویستی بە ڕێنمایی ناوخۆ هەبێت.

نوێژی هەینی بە گرنگییەکی دیارەوە ئەنجام دەدرێت، قورئانی پیرۆزیش تاکە کتێبی ئاسمانییە کە دەخوێنرێتەوە و لەبەر دەکرێت و لە هەموو شار و ئاوەدانییەك و لە هەموو کات و سەردەمانێکدا [1] .

---

[1] مەوسوعەی بەریتانی ((Encyclopeadia Britaniea)) دانی بەوەدا ناوە کە قورئان لەسەر زەویدا لە هەموو کتێبێك زۆرتر دەخوێندرێتەوە. بڕوانە ((دائرة المعارف البريطانية، مادة: Mohammed)).

بانگ له هەموو مزگەوتەکانەوە بە یەك شێواز بەرزدەبێتەوە و دەنگدەداتەوە، ڕەمەزان بریتییە لە مانگی ڕۆژوو لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا هەر چەندە وەرز و کەشوهەوا بگۆڕێت، مسوڵمانان پێکەوە لە هەردوو جەژنەکەدا (ڕەمەزانو قوربان) خۆشی و شادی دەردەبڕن، دوو ڕکات نوێژی سوپاسگوزارانە بۆ خودا دەکەن و دوای نوێژەکە وتار دەخوێنرێتەوە و مسوڵمانان بە هەموو چین و توێژ و ئاستە جیاوازەکانەوە ئامادەی دەبن.

خەڵکی لە هەموو لایەکەوە و لە دوور و نزیکەوە بۆ بەجێهێنانی فەریزەی حەج ڕوودەکەنە مەککە، ئەویش بەبێ هیچ پچڕان و دابڕانێك بە درێژایی مێژووی دوور و درێژی ئیسلامی، بێگوێدانە هیچ ئاڵوگۆڕێکی سیاسی و پەرەسەندنێکی ئابووریی و کۆمەڵایەتی.

سڵاوی مسوڵمانان لە هەموو وڵاتێکدا سەلامکردنە (السلام علیکم)، ئەوانە هەمووی شێوازێکن لە یەکێتی و یەکبوون کە وێنەی لە هیچ گەل و ئایین و کۆمەڵگەیەکدا نییە.

کەسانێکی خاوەن فیکرو قەڵەم لە خۆرئاواییەکان هەستیان بەم یەکێتییە ناوازە و تاقانەیە کردووە و ئاماژەیان بۆ کردووە، تەنها دووانیان بەشایەتی دەهێنینەوە:

هامیلتۆن جیب دەڵێت:

(ئیسلام تیڕوانینێکی هەماهەنگ (منسَّق)ـە، کە لە شێوەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و یەکێتی ئایینیدا دەرکەوت، ئەم تێڕانینە دەورەی ڕووبەرێکی فراوانی کات و شوێنی داوە، تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکانی ئیسلام لە زۆر ناوچە و سەردەمی جیاجیادا دەرکەوتن، بە ئەندازەی بەریەککەوتن و

تێکەڵبوون بەهێزە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتی و سیاسییە ناوخۆییەکان، بۆ نموونە: ئیسپانیا لە باکووری خۆرئاوای ئەفریقیا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا پەیوەست بوو بە لانکەی ئیسلامەوە لە خۆرئاوای ئاسیادا، کەلەپوور و فەرهەنگی ئیسپانیا بەشێك بوو لە کەلەپوورو فەرهەنگی ئەو ناوەندە ئیسلامییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێك بواردا لەو جیاواز بوو، هەندێك تایبەتمەندی هەڵگرتبوو، کە کاریگەری بەهێزی لەسەر خۆرئاوای ئاسیا هەبوو، بەهەمان شێوە، ناوچە سەرەکییەکانی دیکەیش کە خۆژێنی (الإكتفاء الذاتي)یان هەبوو، وەکو نیمچە قارەی هیندی و ئیندۆنیزیا و ناوچە بیابانییەکان لە خوارووی ڕووسیاوە تا سنووری چین تایبەتمەندی هەرێمایەتی خۆیان هەڵدەگرت، بەڵام پارێزگارییان لە مۆرکی تایبەتمەندی ئیسلامییانە دەکرد) [١] .

هەروەها ( وێڵفەرد کانتوێل سمث ) دەڵێت: (سەرکەوتنی مسوڵمانان سەرکەوتنی ناوخۆیی ئایینەکەیان بوو، ئەوان بە تەنها لە مەیدانی جەنگدا سەرکەوتنیان وەدینەهێنا، کاریگەرییشیان تەنها لەسەر چەند لایەنێکی جۆراوجۆری ژیان دروست نەکردبوو، بەڵکو ئەوان سەرکەوتنیان لە ئاڕاستەکردنی ژیان بەشێوەیەکی گشتیو نوێ و مۆرکردنی بە مۆرکێکی تایبەت وەدیهێنا، ئەوەش ئەوەیە کە بە شارستانیەت دەناسرێت.

لە پێکهێنانی ئەم شارستانیەتە ئیسلامییەدا، چەندەها فاکتەر هاوبەشی کردووە، وەکو فاکتەری عەرەبی، یۆنانی، شارستانییەتی (سامی) خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ئێرانی ساسانی، ڕەگەزەکانی هیندی، بەڵام

---

[١] Hamilton A. R. Gibb, Studies of Civilization of Islam London, ١٩٦٠, P. ٣.

بلیمەتیی  مسوڵمانان لەوەدا ڕەنگی دابووەوە، کە هەماهەنگی خستبووە نێوان ئەم فاکتەرە جۆراوجۆرانەوە و هەموویانی لە بۆتەقەیەکی نوێدا تواندەوە و ملکەچی یەك مەنهەجی پێکەوە گونجاوی کردن، بێئەوەی ئەم فاکتەرانە تایبەتمەندییە خۆییەکانیان لەدەست بدەن، بگرە بە پێچەوانەوە، بەشێوەیەکی گشتگیر پەرەیان سەند، ئەوە ئیسلام بوو، کە هەستا بە پەرەپێدان و کاملکردنی ئەم فاکتەرانە و هێزیی مانەوەی پێدان، ئەو مۆرکێکی ئیسلامی بە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ژیان بەخشی، جا بنەما و ڕەگەزە پێکهاتەکانی ئەو لایەنە هەر چییەك بوو بێت.

بەرنامەو پرۆگرامی ئیسلامی (المنهج الإسلامي) یەکێتی و هێزی بۆ ژیان و کۆمەڵگا سازدا، قانونی ئیسلامییش ڕۆڵێکی جەوهەریی بینی لە پێکهێنانی ئەم هێزە یەکگرتووەدا، هەر ئەویش بوو بەو تەوژمە ڕامالێنەرە دیاریکراوەی هەستا بە ڕێکخستن و سازدانی هەموو لق و پەلوپۆکانی ژیان و کونج و کەلێنەکانی، هەر لە بەندایەتی و خواپەرستییەوە بگرە تا موڵکداری و حوکمڕانی.

بێگومان قانوونی ئیسلامی هێزێکی یەکخەر بوو، کۆمەڵگەی ئیسلامی هەر لە (قورتوبە)وە هەتا (مـولتان) پێکەوە دەبەست، هەر ئەویش یەکێتی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا سازکرد و وای لە هەموو کار و کردەوەکانی دیکەی ژیان کرد، کە بەکەڵك و ئامانجدار بن بەهۆی مۆرکردنیان بە مۆرکی ئاسمانی و یەکێتییەکی بە زەمان بەخشی وای لەکۆمەڵگا کرد پەرەبسێنێت و نەشونما بکات. پاشا و سوڵتانەکان نۆرەیان دەکرد و بەدوای یەکدا دەهاتن، حکومەتانێك بەرپا دەبوون و حکومەتانێك

دەڕووخان، بەڵام ڕۆڵیان لە ئاڕاستەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە زەویدا ـ لەچاو ڕێنماییە ڕەببانییەکاندا ـ پەراوێزاوی و لاوەکی بوون) [1] .

ئەوە شارستانییەتێکە تێکەڵ بە چاودێری و ناوی خودا کراوە، ڕەنگکراوە بە ڕەنگی خودایی[2]، بنیاتنراوە لەسەر بناغەی باوەڕ، جا بۆیە ناتوانرێت دابڕنرێت لە مۆرکی ئایینی و ڕەنگی خودایی و ڕۆحی ئیمانی، هەر شتێکیش دژ بەوانە بوەستێتەوە وەك دەمارگیریی نەتەوایەتی، لووتبەرزیی جاهیلی، جەنگی ڕەگەزایەتی (حرب العنصرية)، نەهامەتی ماددی، ڕەوشتنزمی، یان بێسەرەوبەرەیی کۆمەڵایەتی، ئەوە پێشهاتێکی کاتییە بۆ سەر ئەو شارستانییەتە، لەدەرەوە هاتووە، یان هێنراوە، یان خڵتە و خەوشی ئەو ژینگە و کۆمەڵگایانەیە کە ئیسلام چووەتە ناویان، یاخود بەهۆی لاوازیی ڕۆشنبیریی ئیسلامی و کەم سەرقاڵ بوونە بە قورئانی پیرۆز و فەرموودە بەرزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و سەرچاوە ڕەسەنەکانی ئیسلام لەم وڵاتانەدا.

---

[1] Welfred Cantwell smith: Islam in Modern History, Newyork, ١٩٥٧, P. ٣٦ – ٣٧.

[2] ئەو وشانەی لەم ئایەتەوە وەرگرتووە: ((صِبْغَةَ اللّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدونَ)). (البقرة: ١٣٨) (طاهر).

## نهێنی سەرکەوتنی هەوڵەکانی چاکسازیی و نوێگەری لە مێژووی ئیسلامدا

هەوڵەکانی چاکسازیی و نوێگەریی و بەربەرەکانێی خراپەکاریی و بیدعەکان و پاشماوەکانی جاهیلییەت لە مێژووی گەلان و وڵاتانی ئیسلامیدا بە جۆرێك بەردەوام بوو کە وێنەی لە مێژووی ئوممەتان و ئایینەکاندا نەبووە و نەزانراوە، ئەو هەوڵانە سەرکەوتنێکی بۆ نووسرا کە بۆ هیچ هەوڵێکی چاکسازیی و ڕاستکردنەوە لە مێژووی ئوممەتان و ئایینەکانی دیکەدا نەنووسراوە و نەهاتۆتە دی[1].

ئەویش لەبەر تەواو گونجانی ئەم هەوڵانە بوو لەگەڵ جەوهەر و ڕۆح و دەروونی ئەم ئوممەتەدا، هەروەها لەبەر گوزارشتکردنیان لەو بناغە و بنەمایانەی کە قەوارەی ئەم ئوممەتەیان لەسەر ڕاوەستاوە و لێیانەوە مێژووی ئەم ئوممەتە و بەردەوامێتییەکەی سەرچاوەی گرتووە.

## کاریگەریی لە شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا پێویستە درێژەی هەبێت و بەردەوام بێت

دوای ئەوەی ڕاڤەی هەندێك لە بەخششە شارستانییەکانی ئیسلاممان کرد، باسی ئەوەشمان کرد، کە چەندە خەڵات و بەخششی پێشکەش بە شارستانییەتی مرۆڤایەتی کردووە و چ سەرکەوتنێکیشی لە قوتارکردنی شارستانییەتی مرۆڤایەتی لە داڕووخان و خۆکوژیی و توانای پێشکەوتن و

---

[1] بڕوانە پێشەکی بەشی یەکەمی زنجیرەی کتێبی ((رجال الفكر والدعوة في الإسلام))ی دانەر، نموونەی ئەم سەرکەوتنەش لە هەر چوار بەرگی کتێبەکەدا بخوێنەوە. (طبعة دار إبن كثير الأولى دمشق – بيروت ١٩٩٩م ).

گەشەکردنی وەدیهێناوە، لەدوای ئەو باسە پێویستە ڕاستییەکی نەمری مێژوویی باس بکەین.

ئەویش ئەوەیە: کارتێکردن لە شارستانییەتی مرۆڤایەتی و خستنەوە پێشچاو و تەماشاکردنی سەرلەنوێ و کات لە دوای کات و دەرخواردانی شتی دێرینی باش و نوێی بەکەڵك و ڕێگاگرتن لە توخم و ڕەگەزەکانی وێرانکاریی و لەناوبردن و ئاڕاستە خراپ و ڕووخێنەرەکان پێویستە درێژەی هەبێت و بەردەوام بێت.

ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

هۆکاری یەکەم: ئوممەتان ملکەچی فاکتەرە نوێیەکانن لە چاکسازیی و خراپەکاریی، ژیانیش هەمیشە لە جووڵە و گەشەسەندندایە، ڕاوەستان و مەنگی نازانێت، جا لەبەر ئەوە پێویستە کات لە دوای کات چاودێری بکرێت و پێداویستییە نوێیەکانی دابین بکرێت، ئەوەتا لەم سەردەمەی دواییدا چەندەها بانگەواز و فەلسەفەگەلی تێکدەر و ڕووخێنەر سەریانهەڵداوە، کە تیایدا (واتە لەم سەردەمەی دواییدا) ئوممەتی ئیسلامی ـ بەداخەوە ـ پاشەکشەی کرد لە مەیدانی سەرکردایەتیکردنی مرۆڤایەتی و سەرقاڵ بوو بە دەردی خۆیەوە.

هۆکاری دووەم: ئوممەتی ئیسلامی ئوممەتی پەیامی کۆتاییە و ئوممەتی نەمری (الخلود)ـە، هیوا و ئومێدی مرۆڤایەتییە، بۆیە لەسەری پێویستە بەردەوام هەڵگری پەیامەکەی بێت و بە ڕۆڵی خۆی لە سەر قافڵەیی مرۆڤایەتی و سەرپەرشتیاری سەر جیهان و چاودێری سەر بیروباوەڕ و ئەخلاق و پەیوەندی مرۆڤـ بە مرۆڤ و گەل بە گەلەوە، هەستێت.

ئوممەتان تەنها بەمێژوو ناژین، یان بەوەی کە لە ڕابردوودا ڕۆڵێکیان بینیوە و سەرکەوتنیان لە سەردەمێکی پێشوودا وەدیهێناوە و بەس، بەڵکو ئوممەتان لە هەموو زەمانێکدا بە خەباتی نەپساوە و چالاکی هەمیشەیی و هەستکردنی بەردەوام بە بەرپرسیارێتی و ئامادەبـوون بـوون بۆ بەخشینی گیان و بەنرخترین دارایی لەپێناو پەیامەکەیاندا و بە تازەگەریی و داهێنان و بەرهەمی بە سوودی نوێ و شتی چاکی زیاتر دەژین، بەڵام ئەگەر بپێچێتە خۆیەوە و هەر خەریکی خۆی بێت و دەسبەرداری پلە و پایەی بێت، ئەوا لە تۆماری مێژووشدا دەپێچرێتەوە و زەمان لە بیری دەکات، جا بۆیە لەسەر ئوممەتی ئیسلامی واجبە سەرلەنوێ و جارێکی دیکە بە بەرپرسیارێتی بانگەوازکارانەی شارستانییانەی ئاراستەکارانەی پێشەنگکارانەی خۆی هەڵسێتەوە.

ڕاستییەکی زانستی و مێژوویی دیکە، ئەوەیە: ئوممەتی ئیسلامی ناتوانێت بە ڕۆڵی کارتێکردن لە شارستانییەتی مرۆڤایەتی و ئاڕاستەکردنی هەستێت، ئەگەر بێت و خۆی لەسەر خوانی شارستانییەتە بیانییەکان مشەخۆر بێت و لە دەریای ئەوان هەڵگوزێ و هەتا بناگوێی نوقمی شەپۆلی ئەو شارستانییەتانە بێت.

ئوممەتی ئیسلامی ناتوانێ سەرنجی گەلان بۆ خۆی ڕابکێشێت، چ جای ئەوەی وایان لێبکات لاسایی بکەنەوە و شوێنی بکەون، ئەگەر باوەڕێکی قووڵی بەوە نەبێت، کە ئەو شارستانییەتەی ئەو هەیەتی شارستانیەتێکی سەربەخۆیە و خاوەن کەسایەتییەکی تایبەتە، ڕەبانییە، ئاسمانییە، گونجاو و لەبارە بۆ هەموو کات و شوێنێك، لەسەر بناغەگەلێکی پتەوی وەرگیراو لە قورئان و سوننەت بنیاتنراوە.

هەڵقوڵاوی ڕێنماییە ڕەببانی و نەبەوییەکانە و تێڕوانینێکی تایبەتی بۆ (الطهارة)و داوێنپاکی (العفة) هەیە، (طهارة) تیایدا هاوواتای وشەی (نظافة) نییە، عیففەتیش هەر خۆدوورگرتن نییە لە تاوانە ئەخلاقییەکان و بەس، بەڵکو لەو مانایە فراوانتر و گشتگیرتر و مانا هەڵگرترە.

ژیانی ئوممەتی ئیسلامی ناگونجێ و لەگەڵ شارستانییەتی خۆرئاواییدا هەڵناکات، کە لە ژێر فشاری کۆمەڵە هۆکارێکی مێژوویی تایبەتدا پەیدا بووە و هەڵقوڵاوە، لە ژینگەیەکدا کە ماددییەت تەحەککومی تێدا دەکرد و دوژمنایەتی ئایین و شۆڕشکردن دژ بە ئەخلاق و بەها بەرزەکان - بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ - بەسەریدا زاڵ بوون، وەك یەکێك لە شارەزایانی ئەم شارستانییەتە و مێژووەکەی، دکتۆری زانا (محەممەد ئیقبال) بە کورتی دەڵێت: (ڕۆحی ئەم شارستانیەتە (خۆرئاواییە) بە پاکی و بێگەردی نەماوەتەوە)[1].

باوەڕم وایە کارێکی زۆر ئاسانە، کە ئاسانکارییە مەدەنییەکان و سوودوەرگرتن لە ئامێر و داهێنراوەکان و ئەوەی زانستی نوێ پێیگەیشتووە لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەی، کە شارستانییەتی ئیسلامی هەیەتی لە: جوانی و سادەیی و جددییەت و بایەخدان بە هەردوو جۆری پاکی (الطهارة والنظافة) و دوورکەوتنەوە لە دەستبڵاوی و ماڵ بەزایەدان و ڕۆچوون لە بایەخدان بە ڕووکەش و دیمەنی دەرەکی، کۆبکەینەوە.

کۆکردنەوەی ئەم دووانە پێکەوە کاتێك سەردەگرێت، ئەگەر حکومەت و کۆمەڵگا ئیسلامییەکان لە پلاندانانی مەدەنی و سەربەخۆی دوور

---

[1] بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ بەندی ((أهمية الحضارة الإسلامية والحاجة إليها)) لە کتێبەکەمان ((العقيدة والعبادة والسلوك)) ل ١٩٨ – ١٩٩.

لەلاساییکردنەوەی کوێرانەو کاری سەرپێییانەو هەستکردن بەدەردی خۆبەکەمزانین، سەرکەوتووبن.

سەرەڕای ئەوانەش، ئەگەر بێتو زیرەکیو ڕەسانەیەتییان لەلا فەراهەم بێت لەگەڵ باوەڕبوون بە چاکی ڕێنماییە ئیسلامییەکان و شارستانییەتی ئیسلامی کە هەڵقوڵاوی ئەو ڕێنماییانەیە و لەسەریان ڕاوەستاوە و کەسایەتی ئەو شارستانییەتەش لە بەرچاو بگیرێت.

## پێغەمبەرێك ڕەحمەت بۆ جیهانیان و ئایینێك ڕەحمەت بۆ مرۆڤایەتی

ئەم لێکۆڵینەوە مێژووییە شیکارییە و ئەم خستنەڕووە جیهانییە ئامانجدارەی ـ دوای فروستادەیی محەممەد ـ (دروودی خوای لەسەر) بەوە کۆتایی پێدێنین، کە لە کۆتایی کتێبەکەمدا (السیرة النبویة) [٢] دا هاتووە، تا ببێتە گوڵاوی سەرمۆر بۆ ئەم توێژینەوەیە.

دونیا لە دوای ڕەوانەکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) گۆڕا، هەرچۆن کەشوهەوا دەگۆڕێت، ئەویش بە فەزڵی ڕێنماییە بەرزەکانی ئەو پێغەمبەرایەتییەوە بوو.

مرۆڤایەتی لە وەرزێکەوە کە هەمووی بێ بارانی و پایز، هەمووی گڕە و زریان بوو، بۆ وەرزێك تێپەڕی کە هەمووی بەهار و گوڵ و بەهەشت و باخانێکە کە جۆگەلە و ڕووبار بە ژێریدا بڕوات.

سروشتی خەڵك گۆڕا، دڵەکان بە نووری پەروەردگاریان ڕووناکبوونەوە، ڕووکردنە خودا بوو بە کارێکی گشتی، مرۆڤ تام و چێژێکی دەستکەوت کە

---

[٢] الطبعة الثانية عشرة، طبعة دار إبن كثير الأولى ١٩٩٩م.

پێشتر پێی ئاشنا نەبوو و تاقی نەکردبووەوە، خۆشەویستییەك دڵی داگرت کە لەوەوپێش نەیناسی بوو!.

دڵە خاڵی و وێرانەکان، لاواز و تەنگەکان، سارد و سڕ و خامۆشەکان بە گەرموگوڕی ئیمان و هێزی سۆز و بەزەیی بووژانەوە، عەقڵەکانیش بە نوورێکی نوێ ڕووناکبوونەوە و دەروونەکان بە مەستییەکی نوێوە سەرقاڵ بوون، مرۆڤایەتی پۆل پۆل دەرچووە دەرەوە و بە شوێن ڕێگەی ڕاست و پایەی بڵندی خۆیدا دەگەڕا، سۆزی بۆ پلەی بەرز و باڵای دەجووڵا، هیچ نەتەوە و گەلێك و هیچ وڵاتێکت نەدەبینی ئیللا ئەویش دەیویست پێشبڕکێ و ململانێ لەم مەیدانەدا بکات.

عەرەب و عەجەم، میسر و شام، تورکستان و ئێران، عێراق و خۆڕاسان، باکووری ئەفریقیا و ئەندەلوس، وڵاتی هیند و دوورگەکانی خۆرهەڵاتی هیند، هەموو مەستی ئەم خۆشەویستییە باڵایە و ئەم فەیزە ئاسمانییە بوون، عەشقی ئەم ئامانجە بەرزە و هەژاری بەر ئەم دەرگا بڵندە بوون.

مرۆڤایەتی وا دەهاتە پێشچاو، کە وەئاگا هاتبێت و لەخەو هەستا بێت و چاوەکانی لەدوای سڕبوونێکی قووڵ و درێژ، کە چەندەها سەدە درێژەی کێشا بوو، کردبێتەوە، دەیویست بەوە ڕابگات کە لە دەستی چوو بوو، تا وای لێهات هەموو بەشێکی ئەم مرۆڤایەتییە و هەموو کونج و قوژبنێکی بە بانگەوازکارانی ڕەببانی و دڵسۆز، موجاهیدانی چاکساز، پەروەردەکارانی خواناس، سووتاو بۆ خەڵقی خوا، بەخشەری نەفس و نەفیس بۆ خێر و خۆشی مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی لەو مەترسییەی لە هەموو لایەکەوە ئابڵۆقەی دابوو، ئاوەدان بووەوە!.

ئەوانە، پیاوانێك بوون فریشتەکان خۆزگە (غبطة)یان پێدەبردن، کوانووی دڵە ساردوسڕەکانیان هەڵگیرساند و بڵێسەی خۆشەویستی خودایییان گەشاندەوە و جۆگەلە و ڕووباری زانیاریی و ئاداب و دانایی و مەعریفەیان هەڵبەست و دەروازەی کانی و سەرچاوەیەکی بەگوژم و هەڵقوڵاوی عیلم و عیرفان و ئیمان و حەنانیان ئاوەڵا کرد، لە دەروونی مرۆڤدا ڕقێکی نوێیان دژ بە جەور و ستەم و دوژمنایەتی و دەستدرێژیی و یەکتربوغزاندن، ڕواند.

گەلانی چەوساوە و سووکایەتیپێکراو و زەبوونکراویان فێری وانەکانی یەکسانی کرد و باوەشیان بۆ سەرجەم تووڕدراو و کەنارخراو و دەرکراوان، ئەو هەژار و داماوانەی کە کۆمەڵگا تفاندبوونیەوە و کەسوکار و خێڵەکانیان وەدەریان نابوون، کردەوە، هەموویانیان گرتە سنگەوە، سنگی ئاوەدان و پڕ لە سۆز خۆشەویستییان!.

پاشماوە و شوێنەواریان دەبینی و شوێندەستیان بە هەموو بەشێك لە بەشەکانی ئەم زەمینە پان و پۆڕەوە دیارە، هەروەك ئەو جێگایانەی کە باران دەیانگرێتەوە، چۆن لە دەشتودەر و بەسەر دەوارنشینەکاندا دەبارێت، بەهەمان شێوە، بەسەر ئاوەدانی و لادێ و شاریشدا دەبارێت!.

سەیری کرۆك و کاکڵەی کارەکانیان بکە، سەیری چۆنێتییەکەی (Quality) و چەندێتییەکەی (Quantity) بکە و سەرنجی بەرزیی و بڵندی بیر و فکریان بدە، چۆن بە ئاسمان و ئاسۆگەی بەرز و بڵندا دەفڕێت.

سەیری هەستی ناسك و ڕۆحی نەرمونیان و زیرەکی گڕگرتوو و سروشتی ساغ و دروستیان بکە، چۆن پەرۆشن بۆ مرۆڤایەتی، چۆن وەکو مۆم بۆی

دەسووتێن، چۆن دەروون و ڕۆحەكانیان پێچ دەدات و لە ئاگری بەزەییهاتنەوە و سۆز و خەفەتی خەڵك و سووربوون لەسەر قازانج و چاكەیان دەتوێتەوە، چۆن خۆیان دەخستە مەترسی و لەناوچوونەوە، بۆ ڕزگاكردنی خەڵك و دوورخستنەوەی بەڵا و نەهامەتیش لێیان، پێشوازییان لە زەرەر و زیان دەكرد.

بڕوانە كاربەدەست و فەرمانڕەواكانیان چۆن كاروباریان بەڕێوەدەبرد و چۆن هەستیان بە لێپرسراوی دەكرد، بە شەو پاسەوانییان دەگرت و بە ڕۆژیش سنوورەكانیان لە دوژمن دەپاراست، چۆن گەلیش لەگەڵیاندا هەماهەنگ و تەبا و گوێڕایەڵی فەرمانەكانیان دەبوون! !

هەروەها بخوێنەوە هەواڵی خواپەرستی و بەندایەتی و زوهد و حاڵەتی پاڕانەوە و لاڵانەوەیان، ڕەوشتبەرزییان، شایەتیدان لەسەر خۆیان و چاوەڕوانكردنی پاداشت لەلای خودا بۆ ئەو كارەیان، خۆشەویستیان بۆ منداڵان و لاواز و بێهێزەكان، دڵنەرمییان لەگەڵ برایان و هەڤاڵانیان، بەخشندەیی و دڵفراوانی و لێبووردەییان بەرامبەر دوژمنانیان.

دەبینیت خەونی شاعیران و ئەدیبان و خەیاڵی بەپیتیان و بەهرەی بەڕێژنەیان، ناگاتە ئەو لوتكە بەرزەی، كە ئەوانە لە جیهانی حەقیقەت و واقیعدا پێیگەیشتبوون، ئەگەر ئەو هەواڵانەی لەم بارەوە هاتوون خەڵكێكی زۆر و بێشومار نەیانگێڕایەتەوە و شایەتە زۆر و زەوەندە متمانەپێكراوەكانی مێژوو نەبوونایە، ئەوا ئەم هەواڵانە هەروەك چیرۆك و ئەفسانەگەلێك دەهاتنە پێشچاو، كە خەیاڵ چنیبێتی و ڕازاندبێتیەوە.

ئەم وەرچەرخانە مەزنە و ئەم ڕۆڵە گەشەدار و نوێیە موعجیزەیەكە لە موعجیزەكانی سەروەرمان محەممەد (دروودی خوای لەسەر) و شاكارێكە لە

شاكارەكانی پێغەمبەرایەتییەكەی و سروەیەكە لە سروەكانی ڕەحمەتی ئیلاهی كە هەموو كات و شوێنێكی گرتەوە.

خوای گەورە و مەزن ڕاستی فەرمووە كە دەربارەی فەرموویەتی:

(وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ) (الأنبياء: ١٠٧).

واتە: وە تۆمان ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر) تەنها بۆ ئەوە ناردوە، كە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانییان.

**(وصلى الله على نبيينا محمد**
**وعلى آله وأصحابه وأتباعه إلى يوم الدين وسلم تسليماً)**

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**

سەنتەرێکی کوردستانیی ناحکومیی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا. لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان.

سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستەکۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵیی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.
- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکانەوە بۆ زمانی کوردیی، لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردییدا.
- بەستنی کۆنگرەی زانستی و کۆڕ و سازدانی سیمینار لە لایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.
- خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لە لایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.
- هاوکارییکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستیی.